**ئەھل " اھل "** : (١) شایان ، خاوەن ، پسپۆر ، (٢)بنەماڵە، خێزان ، خانەوادە ،

**ئادابی تەریقەت** : رێ و رەوشتی سوفیایەتی،رێ وشوێنی دەرویشی .

**ئایات " آیات "** : کوی ئایەت = آیت " ە ، ئایەت : بەڵگە ، نیشان .

**ئەجەل " اجل "** : ئاکام ، وعدەی مردن ، ئەودەمەی ژیانی کەسێک تیێدا تەواودەبێ، وەختی شتێک .

**ئەمەل " امل "** : ئاوات ، هیوا ، ئامانج ، ئارەزو ،.

**ئەرشەد"ارشد"** : ئازاتر ، گەورەتر ، بالاتر ، ئەوکەسەی کەلەناوهاوکاران و هاوڕیبانی خۆی دا پلەیێکی بەرزتری هەبێ . ئەوکەسەی بەرێی راستدادەروا ، پێگەیشتوتر ، بەتەمەن تر ، گەورە وسەرکردەی دەستەیەک .

**ئەسەر" اثر"** : شوێن ، نیشان ، شوێنی پێ، گیرانەوە ، هەموشتێکی کەوێنەی مابیتەوە ، نیشانەو بەڵگەیەکی بونی شتێک لەوەختێکا لەشوێنێک پیشان بدات .

**ئەساس " اساس "** : بناخە ، پایە ، بنچینە .

**ئەعلا "اعلی"** : بەرز ، بالا، بلند ، "مەعنەوی" خودا ـ دەرەجەی ئەعلا کا .

**ئەحکام " احکام"** : کوی " حوکم = حکم "ە ،فەرمان، هەموفەرمانێکی کە لەدادگا دەردەکری بۆکارەسات وروداویک .

**ئەشیا " اشیاء "** : کوی " شیئی" شت ، شتومەک ،کەل ویەل

**ئەشرەف " اشرف "** : گەورەتر ، مەزنتر ، بەرێزتر ،ئەشرەفی عالەم: بەرێزتر وشەریفترلەهەموعالەم نیازحەزرەتی موحەممەد

پێغەمبەری خوایە .

**ئەفغان " افغان "**: ئاەوناڵە گریان وشیوەن ، بانگ و هاوار ، فەریادوزاری .

**ئەرەستو " ارسطو "** : حەکیم وزانای نیوبەدەرەوە کـــه مامۆستای ئەسکندەری مەقدونی بووە .

**ئەزهار " ازهار "** : کوی " زەهر ـ زهر "ە گول ، شکوفه ، پشکوتنی خونچەوگـول .

**ئەجــزا " اجزاء "** : کوی " جوزئ = جزء "ە ، بەش ،پارچە لەشتێک ، بەشێک لەشتێک .

**ئەمیــر " امیــر "**: فەرمانرەوا ، فەرماندە ، میـــر .

**ئەشعار " اشعار "**: کـوی " شێعر = شعر "ە ، چامە ،هونراوە .

**ئەزەل " ازل "** : هە،بشەیی، ئەوەی سەرەتاودوایی نیـــه ، هەربووە وهەردەبێ .

**ئەقوال " اقـوال "** : کوی " قەول = قول "ە ،قسە،وتار .

**ئەکـل " اکـــل "** : خــواردن .

**ئەفسورده " افســرده "**: ژاکاو، خەمگین ، دل تەنگ ، دل ـ سارده .

**ئەمن " امـن "**: بیباکی ، دلنیایی ، بی ترسی ،هێمنایەتی دل ، ئاسایش ، دژی خۆف .

**ئەخلاف " اخلاف "**: کوی " خەلەف = خلف "ە ،جێ نشینـــان، لەپاش بەجێماوان ، داهاتووان .

**ئەنیس " انیس "**: هاودەم، ئەوەی دل دەداتەوە ، ئەوەی ـ دەبێتەمایەی خۆشی بۆیەکیکی تەنیا وگوشەگیر .

**ئەولیا " اولیـاء "** : کوی وەلی، "اولیاءالله": دوستانی

خودا ، بەندەگانی نزیکی دەرگای خودا ، لەزاراوەی خواناسان وعارفاندا ئەولیا لەدوی ئەنبیا وپێغەمبەرانن کەکەرامەتیان هەیە ودەتوانن نهێنیەکان ئاشکرا بکەن ، پیاوچاک ، شێخی دین .

**ئەوساف** " اوصاف " : کوی " وصف = وەسف "ە چلۆنایەتی شیتی، ئەونیشانانەی شتێک یا کەسێکیان پێ دەناسرێتەوە ،پەسند ، وەسپ .

**ئێکسیر** : (١) زاراوەیێکی زانستی کیمیا یە ، بەتایبەتی لەلایەن کیمیاگەرانی کۆن بەکاردەهێنرا ، ئەوجەوهەرەیەکەبنیادو نەژادی شت دەگۆڕێ، بوبەلگەمس بکا بەزێر وئالتون،دەرمانی کە بەبیروباوەری پێشینیان چاوەی هەمونەخۆشی یەکی کردووە . بیرو باوەری مورشیدی تەواو کەچونایەتی خەلک بگۆڕێ ،(٢) شتییەکجار بەکەلک وسود ، (٣) هەرشتێکی کەمدەست کەوی .

**ئیسلام** " اسلام " : ئاینی موسولمانان لەدەوروبەری سالی ٦١١ زاینی بەهۆی حەزرەتی موحەممەدی کوری عەبدوللا بلاوبووەوە ، لە پیشانا لەنا وعەرەب ، ئینجا لەناوهەندی نەتەوەی تریش .

(٢) چونەناوئاشتی یەوە ، خودان بەدەدستەوە ،موسولمان بون.

**ئیشعار** " اشعار " : ئاگادارکردن، خەبەردان بەکەسێک،زانا کردنی کەسێک بەکارێک ،فێرکردن ، پێ راگەیاندن.

**ئیمکان** " امکان " : (١) ڕێ تێچون ، توانایی بەرامبەر بەکارێک ، ڕێگەخوش کردن ، (٢) لەزاراوەی زانستی فەلسەفەدا ئەوشتەیەکەبون ونەبونی وەکویەکەوپیویست نیە ، وەکوئینسان ، جانەوەر ، کشت وکال ، بێ گیان، بەرامبەرئەوە "وجوب " هەیەکە بونی پیویستە وەکو" واجب الوجود " ئەمەکۆمەلی ئینسان وجانەوەرو کشت وکال وبێ گیانە .

**ئیرەم:** (١) ناوی باخێکەگۆیا شەددا د دروستی کرد بەناوی ئەوەی ببێتەبەهەشتی سەر زەوی ، لەبەر ئەوە بەهەشتی شەددا دیشی پەدەلین (٢) ناوی عەشیرەتیکەلەهوزی "عاد" خودا غەزەبی لێ ـ گرتن لە بەرگوناهی زوریان ، ئەدودا وانە لەقورئانی پیروزدا باس کراوە .

**ئیشراق " اشراق "** : "١) روناک بون ، پرتەوە ،درەوشانەوە تروسکە وروناکی خۆر ، رۆژ هەلاتن .(٢) ئیلهام وەرگرتن.

**ئینسان " انسان "** : ئادلامزاد ، خەلک ، بەشەر ،بیلبیلەی چاو .

**ئولفەت " الفت "** : (١) خووروەوشت گرتن ، دۆستایەتی ، فیربون ، هاودەمی، راهاتن ، هۆگری ، پەیوەندی ودۆستایەتی دەگەل کەسێک یا شتێک ، حەزلەشتێک یا کارێک کردن.

**ئیبداع "ابداع"** : پەیداکردن، بەدی هینانی شتێکی جوان وتازە ، کردنی کارێکی تازە ، لەزاراوەی زانستی بەدیع دا ئەوەیە کەشاعیرشێعریک بلێ . کەچەندسەنعەت لەسەنعەتەکانی بەدیعییەی تێدابێ .

**ئیزهار " اظهار "** : دەرختن ، ئاشکراکردن،رون کردنەوەو دەربرینی قسەیەک .

**ئیشارات " اشارات "** : کوی ئیشارەیە ،(١) پیشاندانی شتێک بەهوی بزوتنەوەی چاویا قامک ، بەدەست وچاویا بروقسەکردن دەگەل کەسێک ، قسەکردن بەرەمز ، قسەکردن بەکینایەت ،(٢) لە زاراوەی بەدیع دا ئیشارە ئەوەیەکەشاعیربەواژە وینەزوردروست بکا .

**ئینشا " انشاء "** : دروستکردن، داهێنان ،نوسینەوەیقسەی

جوان ، وتنیقسەی جوان ، لەخووەشت داهێنان ک نامەی ئەدیبانە ، ڕێکخستن ورازاندنەوەی قسەبەنوسین .

**ئیرتیهاش** " ارتهاش ": دەسە برین ، فروفێل .

**ئیرس** " ارث " : میراث وەرگرتن ، بەشدا ربون لەمیراث ، سەروەت وسامان وهەرشتێکی کەلەکەسیکی مردوبوبنەمالەوخانە — وادە وخیزانی بەجێ دەمینێ .

**ئیمتیحان** " امتحان": تاقی کردنەوە ، تاقیکاری،ئەزمون.

**ئیسناد**"اسناد": گەرانەوەی شتێک بۆسەرشتێکی تـــر ، گەرانەوەی قسەبۆ ئەوکەسەی کەکردبێتی، گەرانەوەی حەدیس بوپێغەمبەر .

**ئیتتیفاق** " اتفاق ": رێکەوت ، دوداو ، کارەسات ،حادیسە

**ئیکمال** " اکمال ": تەواوکردن، گەیاندن بە ئاوات وئامانج .

**ئیفتیرا** " افتراء " بەدرو تاوان بوکەسیک دروست بکری، تاوان هەلبەستن .

**ئیلاهی**: خودایا ، ئەی خودا ، خودایی، زانستی هەراوی — خواناسی .

**ئیقبال** " اقبال": (١) پێشوازی کردن، رودان ، (٢)— بەخت ، چارەنوس ، تالیع .

**ئەمر**" امر": فلارمان ، بریار ، شتی بەرز ، روداوی — گەورە .

**ئیفادە** : دەعیە ، فیز ، تەکەببور ، (٢) هەموئەو وەلامانەی کەسێک دەربارەی مەسەلەیێک لەپرسیارو وەلامیکی رەسمـــی دا — دەیاندا تەوە..

**ئینکار** " انكار ": حاشاکردن ، کەسێکی قسەی کەسی بە گوێی دا نەچی ،لەسەر قسەی خوی سوربێ، ئینکارکردن : پاشە گەزبونەوە لەقسەیەک یا لەکارێک .

**ئیرادەت** " ارادت ": دلسۆزی وئیخلاس لەدۆستا یەتی دا ، ـ دۆستا یەتی راستێکەل بەخۆ بەکەمگرتن و بچوکا یەتی .

**ئیسرار** " اصرار ": لەسەر رویشتن ، پی داگرتن ، سوربون، لەسەرکارێک یا شتێک .

**ئیستیمداد** " استمداد ": یارمەتی ویستن ، کومەک خواستن.

**ئیرشاد** " ارشاد ": رێ نیشان دان ، رێنوینی کردن بۆ رێی راست ، رێبەری کردن ، رێنما یی .

**ئیسم** " اسم " : ناو.

**ئیستادەن** : راوەستان .

**ئیخلاس** " اخلاص ": دلپاکی ودلسۆزی لەدۆستا یەتیدا ،راستی وجگەر سوزی لەکا روکردەوەدا .

**ئیزاعە** "اضاعه": زایع کردن ، بەفیرودان، بەهەدەردان ، لەدەست دانی شتێک بەخۆرا یی ،(٢) زوربونی ئاوو زەمینی کەسیک .

**ئیمزا** " امضاء " : نیشانەیکە لەدوایی نامەونوسراوە ـ دادەندری، نوسینی ناوی نوسەری نامەیەبەشێوەییکی تایبەتی لەپای کاغەزو نوسراوەدا بەئەوەی بزانن کێ نوسیویەتی .

**ئەبلە** " ابله ": بێ عەقل ، تێ نەگەیشتو ، نەزان،گێژ، عەقل سوک ، دەبەنگ ، نەفام، حۆل .

**ئیلتیفات** : چاولەکەسێک کردن لەروی خۆشەویستی ومیهرەـ بانیەوە، روانین لەکەسێک لەچاوی خۆشەویستی یەوە ، چاکەو

میهرەبانی کردن لەگەل کەسێک ، بەنەرمی جولانەوە لەگەل کەسیک .

**ئیلتیماس** " التماس ": داواکردنی شتێک لەکەسێک . شت ویستن لەکەسێک ، خۆبەکەمگرتن ، پارانەوە .

**ئینقیاد** " انقیاد ": وەئەستوگرتن ، رامبون، فەرمان وەرگرتن ، خۆبەکەمگرتن .

**ئیعلان** " اعلان ": راگەیاندن ، ئاشکراکردن، دەرخستن ، نوسراوەیا لاپەرەییکی چاپکراوکەبەهۆی ئەووەوە . مەبەستێک بەخەڵک رابگەیەندرێ بۆ ئاگاداری .

**ئەهلی نیسبەت** : ئەوکەسەی پەیوەندی ونزیکایەتی لەگەل خوا ناسان وپیاوچاکانا هەیە .

**ئەهلی کیبار** : پیاوانی گەورە ، ئەوکەسانەی مەزن و- بەریزن .

ئەرباب " ارباب ": کوی " رب - رەب "ە : خاوەن، بار- هێنەر، جوامێر، خان ، خاوەن پارە ودەولەمەند .

ئەتیببا " اطباء ": کوی " طبیب - تەبیب "ە : حەکیم، پزشک ، دوکتور .

**ئیقلیم** " اقلیم ": هەرێم، مەلبەند، ناوچە، پارچەیەک لەزەوی کەلەباری ئاو وهەوا و وەزعی سروشتی لەگەل پارچەکانیترا جیاوازی هەبێ وهەلبژاردەوچاتری ئەوانی تربێ .

**ئیتتیفاق** " اتفاق ": بەیەکەوە بون، چەندکەسێک کەبیرو راوقسەیان دەکەن بەیەک . هاورێی، هاوکاری، یەکیەتی، هاو- پەیمان ،(٢) روداو، کارەسات، پێشهات .

**ئەدنا** " ادنی ": نزم تر، زەبونتر، پەست تر، نزیکتر .

**ئیمساک** " امساک " : دەسە پێوەگرتن، خۆدورخستنەوەلە

خواردەمەنی (٢) بەخێل ، چاوچنۆک ، رژد .

**ئیفتیراش** " افتراش ": دەستپێکردن بەسەرین ، هەردوباسک کردن بەسەرین .

**ئیفتیشاش** " اغتشاش ": پەیدابون ودەرکەوتنی غەل وغەش وئالودەیی کەلەسیکا یالەشتیکا ، شێواوی ، سورش .

**ئومەنا** " امنا ": کوی " امین = ئەمین "ە دروستکار ، راست ودروست ، دەس پاک ، ئەوکەسەی کەخەڵک باوەری پێی بکا ، حالی ئەوشوێنەی پیاوترسی ئەوەی نەبێ لەوێ شتێکی بەسەربێ یا توشی بەلایێک ببێ .

**ئیدبار** "ادبار": رووەرگێڕان ، پشت کردنەوە ، وەرگەڕانی بەخت ، بەدبەختی، چارەرەشی .

**ئوسول** " اصول ": کوی " اصل = ئەسل "ە ، بنا غەەبنیاد بنج، قانون ، دەستور ، سەرەتاکان، مەبادی سیاسی، داب ودەدستوری کەومەلایەتی .

ب =

**باقــى** : (١) نەمر، هەرمان، بەردەوام، پایەدار، ئەوەی ماوە، ئەوەی لەجێگەی یەکی تردەمێنێتەوە، (٢)ماوەی شتێک کە لەشتێکی تردەردەهێنرێ .

**بارەگاە** : کۆشک، کاخ، قەسری پادشایان، ئەو شوێنەی کە فەرمانرەوایان ئیجازەی خەڵک دەدەن بۆئەوەی پخش بولایان.

**باب** : (١)باوک، (٢) دەرگا، دەرکە، دەروازە،بەشێک لەکتێب .

**باغــى** : لەخوانەترس، زۆردار، سەرکێش، گەردن کەش .

**بایەزید " بایزید"** : بایەزیدی بەستامی عارف و خواناسی گەورەی سەدەی دوهەم وسێهەمی کۆچی یەکەعارفان وزانایان وشا عیرانی ئێرانی وئیسلامی ،" سلطان العارفین" "برهان لموحدین" "مرادالسالکین"، "برهان المحققین" "حجەالخلایق"" مرشد السالکین" نیان ناونا وەو لەئسەستیرەهەرەپرشنگدارەکانی عیرفانە، ناوی ئەبویەزید ئەیعوری کوری عیسای کوری سروشانی بەستامی یە، لەبنەمالەیکی زەرتەزشتی بوکەلە پاشان موسلمان بو، شاری بەسنام لەتەنیشت شارەکانی سەمنان ودامەغای ئیستای ئێرانە .

**بەشارەت " بشارت"** : مزگێنی، موژدە، خەبەری شادی،هەوالی خۆش .

**بەقا "بقاء"** : مانەوە، هەمیشەیی، تێک نەچون،نەمردن، هەرمان .

**بونی ئادەم** : ئادەمزاد، نەوەی ئادەم، خەڵک ،ئینسان مرۆ .

**بەیەت " بیت "** : (١)ماڵ، خانو، خانە، جێگەی ژیان وحەسانەوە، (٢) ماڵی خودا ، کابە ، کەعبە، (٣)دێری شیعر کەلەدونیوەدێرشێعریا میسراع پێک هاتووە، چیرۆک ، داستان،بەیت وبا ووکەلەپوری ئەدەبی .

**بەسیرەت " بصیرت "** :بینایی، زانایی، روناک بینی، زیرەکی، وشیاری، یەقین، رەوشەن دڵی، عەقل،(٢) بریتی یەلە هێزی قەلبی کەبەنوری پیروزروناک بێ وبەمهێزەئینسان حەقیقەت وپاتینی شتەکان ببینێ، هەر بەوجۆرەی کەنەفس بەهۆی چاو وێنەوشێوەوروالەتی شتەکان دەبینێ، زانایان وپێشینیان "بەسیرەت" بەهێزی پیرۆز، واتە" قووەی قودسییە" ناو دەبەن.

**بەرجەستە** : وەسەرکەوتو،کەسێکی بەناوبانک وگەورە، ـ چاک ، هەلبژیردارو، بەرز، چوست وچالاک .

**بەیتولحەزەن " بیت الحزن "** : (١) زوری خەموخەفەت ، ماڵ ومەلبەندی خەوناسور، هەموجێگەییکی کەخەوخەفەتی لێ بێ ، (٢) ئەوژۆرەیەکەیەعقوب تێیدا دەژیا ولەدوری یوسفی کوریدەتلایەوە ولەشین وناسوروواوەیلادابو، " بیت الاحزان" وکولبەیی ئەحزانیشی پێ دەلێن .

**بەیەدەق** : ڕێگاشناندوری سەفەر، رابەری سەفەر، (٢) ناوی یەکێک لەبەردەکانی شەترەنجە، (٣) سەبازی پیادە .

**بینا** : بینەر، وشیار، زیرەک ، ئاگادار، بەهۆش .

**بەزم**: جەژن وئاهەنگ ، کۆبونەوی خۆش رابواردن، کۆری خواردنەوەو سەرخۆشی .

**بەکارەت ( بکارت "** : ژنی نەسمراو، ژنی کون نەکراو، کچێنی، (٢) نۆبەرە، سەرەتاویەکمی هەموشتێک ، تازەبون ،

درینی پەردەی کچێنی .

**بەهابیم" بهائم" : کوی " بهیمە " بەهیمە"یە : ـ** حەیوان چوارپییان ، پاتال ، ئاژال .

**بەعید " بعید " : دور**

**بیمار :** نەخۆش ، ناساغ ، ، کەسێکی تەندورستی بکەوێتە مەترسی یەو .

**بورج :** (١) هەریەکێک لەدوازدەبەشی فەلەک کەزەوی لە دەوری یان دەسورێتەوە ، هەرکاتێک کەزەوییەکێکیان دەبرێ مانگێکی خورشیدی تەواو دەدەبێ ، بەم پێیەبورجەکان دوازدەن ـ بەرامبەردوازدەمانگ .بەرخ ، گا ، دوپەیکە ، قرژال ، شیر ، گولەگەنم ، تەرازو ،دوپشک ، کەوان ، کار ، دەولک ،نەهەنگ ، (٢) کوشک ، قلا ، بینای بلندی خر ، یاچزارگۆشەی کەبۆپاسەوانی بەکاردەهێنرێ ، هێلانەکۆتر .

**بوسە : ماچ .**

**بوهتان :** درو ، بوختان ، بەدروهەلبەستنی قسەیە زمانی یەکێکی ترەوە .

**بوریا :** حەسیر ، هەموورا یەخیکی لەقامیش ولقی دارخورما دروستکرابێ .

**بورهان :** رون کردن ، بەلگە ، دەلیل ، حوجەتە (٢) ناوی گوندێکی سەربە ناوچەی مەهاباده .

**بوعد " بعد ":** دوری ، دوربونەوە ، دورکەوتنەوە .

= پ

**پـا بـوس** : پێ ماچ کەر .

**پـەرچـەم** : کاکۆل ، قژی سەرنێوچاوان (٢) دروشم ، ئـەو- قوماشەیە کەبدا رەوە دەکرێ ودروشم ونیشانەی ولاتێک یا رێکخرا - وێکە ، (٣) ەوجییەیە لەگول داکەتووی لێیە .

**پـرتـەو** : تیشک ، تریفە ، ترووسکە ، پرشنگ ، روناکـایی ، شـۆق .

**پیـــر** : بەسا لاچو ، بەتەمن گەورە ، کۆنەسال ، شێخ ، شێخـی خانەقا ، پیری مەی فرۆش ، پیری تەریقەت ،مورشیدورا بـەری - دەروێشـی .

**پیـری خـەرا بـات** : پیری مەیخانە ، پیری مەی فـرۆش ، لەزا را وەی سوفیـزم دا ئینسانی پۆخت وشا رەزا ، رییەرومورشیـدی " کامیل " کەمریدان بوریی هەژاری وسوفیا یەتی رێنوێنی دەکا ە .

**پیـری مـەیکـەدە** : پیری مەیخانە لەزا را وەی سوفیا یەتی دا ئینسانی وخت وکا میل ، رێبەری رۆحانی، رێنما ومورشید ، پیـری تەریقەت ،بەسا لاچوی با دەفرۆش .

**پیـری کـەنعـانـی** : نیاز ، یاقوب پێغەمبەرە .

**پیـری مـوغـان** : سەروک وگەورەی موغەکان کەپێشەوا یانـی ئایینی زەردەوشتی بون .

**پیـرا هـەنـی یـوسـف** : کراسی یوسف کوری یەعقوبە ،دەلێن رۆژیک هەردوا زدە کوری یەعقوب دەچن بۆسەیران ،یوسف خۆشەویسـترینیان دەبێ لای باوکی، براکانی یوسف دەخەنەبیـرێکەوە ، لـە ئەنجامی ئەرودا وەیەعقوب لەخەفەتا کوێردەبێ، لەپاشاکەکراسە - کەی یوسفی بۆدێنن یەعقوب بۆنی پێوەدەکا وچاوی چا دەبێتـەوەو

بینایی وروناکایی پێشوی دەست دەکەوێتەوە .

**پوختە** : خواردەمەنی پێگەییو ، دژی خاو ،ئینسانی کارامە وزانا و خاوەن تاقی کردنەوە .

**پوپ چنەرمک** : ریش سپی ،

**پەیمانە** : جام، پیالە ، ئەو قاپەیە کەشەراب ومەی تیدا دەخوریتەوە ، کاسە پیکە کەدا نەوێلەوشتی تری پێ دەپێون.

**پەیکان** : تیێر ، سەرەتیر ، هەموئاسنێکی نوک تیژ .

**پەیوەستە** : پێوەند ، بەیەکتری بەستن، بەیەک گەیشتن، هەمیشە .

**پدەر** : باوک ، باب .

**پسەر** : کور ، ئەولادی نێرینە .

ت =

**تـا لـيـع** : (١) بـەخت ، چا رەنـوس ، (٢) دەرکەوتن، دیا ربون هەلاتنی رۆژوما نگ و ئەستێرە ، دیا ربونی دلـبەروخۆشەویست .

**تـا لـیـب " طـا لـب "** : (١) دا خوا ز ، ئەوکەسەی دا وا ی شتێک دەکا تا لـیبا ن : ئەوکـەسا نەی دا وا ی شتێک دەکەن، قوتا بیا ن ، — دا خوا زا ن .

**تـا وس** : با لـندەییکی جوا نە ، نێرینەی توک وپەری رەنگـا و رەنگی هەیە ، توکی لـەسەرەتا ی ها وین دا فری دەدا ودوبا رەهی تا زە دەرویتەوە ، بەزۆری لـەخوا روی ئا سیا وهیندوستا ن دا دەژی، لـە سەدەکا نی نا وەرا ست دا دەولـەمەندا نی ئوروپا گۆشتی تا وسیا ن بـۆ رێزگرتـن لـەپێش میوا ن دا دەنا ، لـەگەل،ئەوەی وەنەبێ گوشتیشـی خۆش بێ، لای هێندێ کەس رەمزی نا لـەبا ری یە ، دەلـێن تا وس بـووە هۆی دەربەدەری ئا دەم وحەووا لـەبەهەشت ، رۆیشتنی بەنا زوخـا ن وخەرما نی کچی جوا ن لـەنا وکوردەوا ری دا لـەگەل رەوتی تـا وس بەرا وا ردو بەرا مبەردەکرێ .

**تـا بـور "طـا بـور"** : لـەشکر، تیپ ، رێز ، فیرقـە .

**تـا زی** : تا ژی، تا نجی، تا جی، جورەسەگێکی را وو شکا رە.

**تـەبیـعـەت** : سروشت ، خوورەوشت (٢) روی زەوی، جیـهـا ن ، دونیا ، هەموگورا ن ودروست کردنێکی کەدەستی ئا دەمیزا دی تێـدا نـەبـێ .

**تـا ریـخ**: مێژو ، دیا رکردنی کا تەهەرشتێک ، دیا ری کردنـی ئەوسەردەمەی کەرودا وی گەورەی تێدا بووە ، لـێکدا نەوی رودا و وبە سەرها تی پێشینیا ن .

**تـا قـی کسـیـرا** : ئەیوا نی کسیرا ، مەدا یین، بەنا وبا نگترین

کۆشک وبالەخانەییکە شاهەنشاهانی ساسانی دروستیان کردووە ،لە پیشانا ئاوەدان ویەکێک بولە خۆشترینی قەسروبالەخانەکانی جیهان، ئیساکەکەلاوەیە ، هێندێ لەتاق ودیوارەکانی ماوە ،بەپێی افسانەی ئایینی ناوکوردەواری گۆیا تاقەکەلەحەزمەت پەیدابونی ئایینی پیرۆزی ئیسلام درزی بردووە ، چونکەرەمزی سەردەمی گاوری وبوت پەرستی بووە .

**تابان** : درەوشەدەر ، ئەوەی روناکی دەدا .

**تابش** : (١) درەوشانەوی، پرئەودان ، روشنایی وگەرمایی رۆژ وهەتاووئاگر (٢) سورکردنەوەی ئاسن بەئاگر .

**تاری زولف** : رەشی مو ،تال، تالی مو ، داوی مو .

**تاعەت " طاعت "** : پەیرەوی کردن ،ئیتاعەتکردن.

**تاماو** : تاوێک کەخۆی وئاردی دەکوِن ودەیدەن بەئاژەل و پاتال .

**تەطبع "طبع"** : خوورەوشت . سروشت .

**تەجەللا " تجلی "** : رون بون ، روناک بون، دیاربون، تیشک ، کینایەتەبوچونی روحی خودا بۆناودلی سۆفی ودەروێش ،ـ ئەوەی دەگاتەپایە " فناء فی الله " : هەروەها کینایەتیشەبۆ دیاربونی نوری خودالەکیۆی تور ، ئەوەی موسای بێ هۆش ومەدهوش کرد .

**تەجرید "تجرید"** : (١) روتکردنەوە ، جیاکردنەوەی ـ شتێک لەهەموشتێکی کەلەبنج دالەنەژادی ئەونەبێ،پیستەلەدار ـ کردنەوە (٢) شیروخەنجەر لەکالان دەرهێنان (٣) تەنیایی، گوشەگیری .

**تەسبیح " تسبیح "** : ئەوکەسەی دەلێ" سبحان الله "،بە

پاکی یادکردنی خودا (٢) ئەورستەوردەشتەیەکەلەمووودەکا ولەکاتی تەسبیحا ت دا لەدەست دەگیرێ.

**تەسویر "تصویر"**: دروست کردنی وێنەی کەسێک یا شتێک گرتنی وینەی کەسێک یا شتێک ، نەخش کردنی شێوەی کەسێک یا شتێک وێنە گرتن .

**تەشریح " تشریح"**: پارچەپارچەکردن، برینیئەندامی لەش ، (٢) رون کردنەوە .

**تەریق " طریق"**: (١)رێگە ، رێ، شەقام (٢) شەرمەزار بون.

**تەشریف " تشریف "**: گەورەخۆپیشان دان ، خودەرخستن وەکپیایەبەرزوما قول .

**تەرەب "طرب "** : هەڵپەرین وسەما لەئەنجامی شادی دا ، شادبون ، خۆشی ئاهەنگ ورابواردن .

**تەرەف " طرف "**: کەنار ، دوایی شت ، لاجێگە .

**تەرح "طرح"**: دانان ، نەخشە کێشان .

**تەریدە**: جەردە ، دز ، رێگر ، چەتە .

**تەخفیف " تخفیف "**: سوک کردن ، کورت کردنەوە .

**تەعنە " طعنە "**: شیونی نیزەلەلەش دا ، قسەی سوک بە یەکێک وتن . دەرختنی کەموکوری کەسێک ، سەرزەنشت کردن.

**تەعمیر " تعمیر "**: ئاواکردن، ئاوەدان کردن، چاک کردنەوەی خانوی روخاو ، چاک کردنەوەی هەموشتێکی کۆن کەکەمو کوری هەبێ ، تێپەکردنی ژیانی زۆر .

**تەعداد**: ژمارەکردن، حیساب کردن، ئەژماردن.

**تەحسیل " تحصیل "**: وەدەست خستن ، وەدەست هینان.

پەیداکردن ، وەرگرتنی زانستبێ .

**تەحەممول " تحمل "**: خۆراگرتن ، لەبەرهەمونا خوشی یەک ، ئارامگرتن ، هیزوتوانا نواندن.

**تەفسیر " تفسیر "** : (١) رون کردنەوەی مانا ومەبەستی قسەییێک ، ئاشکراکردنی مانا ومەبەستی رستەییێک . (٢) رون — کردنەوەی مانای ئایەتیقورئان .

**تەزەرو ( تذرو "**: چور ، ناوی بالندەییکەگوشتی دەخوری، نیرینەی پەروبالی جوانی هەیە ، لەناوجەنگەل وکێلگەگان دا — دەژی .

**تەلیسم " طلسم "**: پارچەکاغەزیان مەعدەنێکەجادوگەرو فالچی یان جەدوەلی لەسەردەکێشن ونوسینی لەسەردەنوسن،باوە— ریان لەسەرئەوەیەکەئەمەپا رێزگاری خەڵکی دەکاوئازاروخراپە— یان لێ دوردەخاتەوە .

**تەلەف " تلف "**: لەناوچون ، لەناوبردن ، نەمان ، فەوتان ، .

**تەلیعە " طليعە "**: پێشەنگ ، پێشرەو ، سەرەتای لەشکر ، دیاری دان ، دەرکەوتن .

**تەعاروف " تعارف "**: یەکترناسین ،بەخیرهێنانی یەکێک پێشکەش کردنی شتێک بەکەسێک .

**تەسەرروف " تصرف "**: بەدەس گرتن، داگیرکردن ،— دەست بردن بۆکارێک یا شتێک ، گۆرینی کارێک بەمایل وئارەزو ، ئەو کەسەی دەبێ بەخاوەنی شتێک .

**تەحقیق " تحقیق "**: پێ راگەیشتن ، لێکۆلینەوە بۆ رون کردنەوەی کارێک یا شتێک ، راستی ودروستی .

تەقسیم " تقسیم": بلاوکردن، بەش کردن، دابەشینەوە .

تەقدیم "تقدیم": وەپێش خستن ، پێشکەش کردن.

تەزویر " تزویر": فریو ، دوروویی، ریاکاری، فێڵ، دەغەلی ، فێل کردن لەکڕین وفرۆشتن دا .

تەتیمەمە " تتمە": دوایی، پایان ، دوایی شت ،ئاخری .

تەغنیە "تغنیە": گۆرانی وتن ، ئاواز دەرخستن.

تەئسیر "تاثیر": کارتێکردن، کارلێ کردن، دەسەلات بەسەردا سەپاندن.

تەهارەت " طهارت": پاکی، پاک وخاوێنی .

تەمەع" طمع": ئارەزو، ویستنی زۆر.

تەزکیر ( تذکیر": یادکردن، وەبیرهێنانەوە ،ئامۆژگاری کردن .

توشە : تویشو ، ئەوخواردەمەنیەی کاتی سەفەرریبوارانـ لەگەل خۆیان هەڵی دەگرن ، خواردەمەنی بۆکاتی پێویستی ،.

تەکالیف " تکالیف": کاری قورس وگران ، کارێک لە توانای ئادەمیزاددا نەبێ، ئەرکی سەخت وگران .

تەواف " طواف": گەران بەدەورەی شتێک دا ، گەرانی شت ، سورانەوە بەدەوری کەعبەدا .

تەمکین " تمکین": هێزوتوانادان، رێگەخۆش کردن.

تەن : (١) لەش ، بەدەن ، جەستە (٢)رەشی مەنجەل .

تەوف " طوف" : سۆران لەدەوری شت دا ، بروانەتەواف.

توفەیلی " طفیلی": نیسبەتەبەکەسێک ناوی توفەیل بووە ، کەبەبێ بانگ کردن بەمیوانی چوتەسەرسفرەی خەلکی،میوانی بانگ نەکراو..

تفـل "طفـل ": مندا ل ، بچوکی ئا دەمیزا ،منا لی سا وا ە .

تـوخـم: توو، دا ن ، دا نە، شەهوەت .

تـوحفـە " تحفـــە": دیا ری، ئەرمەغا ن ، سەوقا ت ، هـەمـو شوێنیکی بچوک وبەنرخ ، هەموشتێکی بەنرخ .

تـەتهیـر " تطهیـر": پـا کـی

تـەبلـە " طبلـە": سندوقێکی بچوک یا کا سەیەک کەلەدا ریـا لەشوشە دروست کرا بێ وعەترفروش لەودا عەتری بۆن خۆش را بگرێ .

ج =

**جـا ن** : (١) گیا ن ، ره‌وا ن ، روح (٢) جنوكه ، جن ،ئه‌جنده .

**جـا نـی جـا نـا ن** : گیا نی گیا نا ن .

**جـا سـوس** : ئه‌وكه‌سه‌ی ده‌نگ وبا س وهه‌وا ل ده‌گه‌یه‌نێ ،ئـه‌و كه‌سه‌ی هه‌وا ڵی نهێنی كه‌سێك یا ولاتێك كۆده‌كا ته‌وه‌ودیدا به‌لاێكی تـر .

**جـه‌لال " جـلال "** : گـه‌وره‌یی، بلـندی، به‌رزی، شكۆه .

**جـه‌ننـه‌ت " جنـت "** : با خ، به‌هه‌شت ، فیرده‌وس .

**جـه‌بـر " جبـر "** : (١) به‌ستنیئیسقا نی شكا و ، نه‌نـدا مێكـی كه‌ئیسقا نی شكا بێ وله‌گه‌ج گیـرا بێ، (٢)نا وی كۆمـه‌لـه‌یێكـی فه‌لسه‌فی یه ، جه‌برییا ن پـێ گتووه بیروراا یا ن ئه‌وه بووه‌كـه ته‌وا وی كرده‌وه‌ی ئا ده‌میزا دبه‌فه‌رما نی خودا یه به‌نده‌هیچ جـۆره ئیـختیا رێكی نیه ، دژی " ا ختیا رتفویض "ه (٣) جه‌برومو‌قـا بـه‌لـه زا نستی یێكی ما تیما تیكی یه‌كه‌تێیدا تیپ لـه‌با تی ژما ره‌بـه‌كـا ر ده‌هێنرێ .

**جـه‌هـل " جهـل "** : به‌هۆشی، نه‌زا نین ، نه‌خوینده‌وا ری،دژی زا نستـی .

**جیلـوه** : ئا شكرا كردن، دیا ری دا ن ، خۆنیشا ن دا ن بـه كه‌سێك (٢) لـه‌زا را وه‌ی سۆفیا یه‌تی وعیرفا ن دا بریتی یه‌لـه‌دره‌و- شا نه‌وه‌ی نوری خوا یی لـه‌نا ودڵی عا رف وخوا نا س دا به‌جۆرێ كـه سه‌ودا سه‌ر وشه‌یدا ی بكا .(٣) ئه‌ودیا ری یه‌یه‌كه‌زا وا لـه‌كا تی به‌یه‌ك گه‌یشتـن دا پێشكه‌ش بوكی ده‌كا .

**جینـش " جنـس "** : ئه‌وشته‌یه‌كه‌لـه‌چه‌ندجۆره‌شتێك پێك ها تبێ، وه‌كوجنسی گیا ندا ر كه‌بریتی یه‌لـه‌ئا ده‌میزا دوهه‌موخا وه‌ن گیا نێك .

(٢) لەزاراوەی زانستی مەنتیق دا جینس ئەوەیەکەلەئەنواع پێک هاتووە، (٣) کەڵ وپەڵ ، کالا.

**جەمع "جمع"**: هەموشتێکی بلاّووپەراکەندەکۆبکرێتەوە، ــ زاراوەیێکی زانستی دیعە، ئەوەیەکەشا عیردوسیفەت یا زیاتر لە یەک حالەت دا کۆبکاتەوە، (٢) کۆمەلێک ، تاقمێک ، کۆمەلێک ئادەمیزاد.

**جەمعییەت " جمعیت "**: (١) کۆبونەوە، یەک گرتن ، تەبایی لەناو یەک دا، (٢) کۆمەلەکەسێک ، خەڵکێکی زۆرلەشوێنێک دا کۆببنەوە.

**جەلاد " جلاد "**: ئەوکەسەی کەکوشتنی مەحکومانی پێ دەسپێرن ، ئەوەی ئازارو ئەشکەنجەکردنی خەڵکی پێ ئەسپێراوە، میرغەزەب .

**جەلا" جلا "** : (١) رون ودیار، ئاشکرابونی هەرشتێک ، (٢) مشت وماڵ کردنی ئاوێنەوشیروخەنجەروشتی ترلەژەنگ وژارو- گەراندنەوەی بریقەوتروسکەی، (٣) دورکەوتنەوەلەماڵ ومەلبەندو نیشتمان .

**جینایەت " جنایت "**: تاوان، سوچ، گوناهی گەورە.

**جەستە** : لەش ، بەدەن .

**جیفە** : کەلاک ، لاشە ، مردار ، لەشی مردوکەخراپ دەبێ و بۆگەن دەکا .

**جەنوب " جنوب "** : قیبلە ، نیوەرو ، یەکێکەلەچوارلاکان بەرامبەر باکورە، لای راستی کەسێکە روبەروی رۆژهەلات ،بوەستێ

**جیهان ئارا** : جیهان رازێنەرەوە.

**جیهانگیر** : ئەوکەسەی کەناوبانگی دەچێ بۆهەموشوێنێکی

ئەم جیهانە، پادشایەک کەولاتانی گەورەدەگرێ .

**جەد** "جـد": باوکی باوک ، باوکی گەورە، باوکی دایک .

**جیسم** " جسم": لەش ، بەدەن ، جەستە، پەیکەر ،هەرشتێکی.

**جەری** "جری": ئازا ، بیباک ، نەترس .

**جەیش** :لەشکر، دەستە، سپا .

**جورم** "جرم": گوناە، تاوان ، خەتا .

**جەولان** : دەورلێدان، هێنان وبردنی ئەسپ بۆهەرلایەک ، هاتوچۆکردنی ئەسپ بۆهەرلایەک .

**جەدەل** " جدل ": گفتوگۆی تیژ، دوژمنایەتی .

**جەزب** " جذب ": کێشان ، ئەوەی کەسێک پانشتیکبۆلای خۆی دەکیشێ .

**جودی** : ناوی کێویکەلەنزیک شاری موسلەوەیەکەیەکێک لەشارەکارنیکوردستانی عێراقە، دەلێن کەشتی نوح پێغەمبەر لەسەرئەمکێوە لەنگەری گرتووە.

**جەزبەی حەق** " جذبەء حق ":

چ =

**چاک** : (١) باش ، پەسند ، داوێن پاک ، پیاوچاک . (٢) درز ، کون ، دراو ، بەروک ، کونێکی گەورەلەجل وبەرگ دا ، یەخەی کراس .

**چاهی زەنەخدان** : چالی چەنە . قولایی ناوچانەی‌هەندێ ژن .

**چاە** : چالاو ، بیر .

**چەمی** : " هەورامی" نیوە نیگایی، نیوەڕوانینی .

**چین** : ریز ، ریزیک لە شتێک (٢) ناوی ولاتێکي بەناو ـ بانگە لەرۆژهەلات دا .

**چەوگان** : گۆچان .

ح =

حاشیە : تەنیشت ، قەراغی جل وبەرگ یا کتێب ، شەرحێکی لەتەنیشت کتێب دەنوسرێ، مەبەستێکی کەلەمەتن زیا دبکرێ .

حەبەش : (١) میللەتێکی پیست رەشەلەئەفریقا دا دەژی ، کەسی پیست رەش ، (٢) کینایەتە بورەنگی رەش ، (٣) ولآتی زنگبار کەخەڵکی ئەوێ رەنگیان رەشە ، لەشێعردا رەنگی رەش کینایەتە بۆشەوە .

حەزین "حزین": خەمبار ، دڵتەنگ ، گرژ ، غەمگین .

حەریق "حریق": سوتاو ، ئەوکەسەی بەئاگردەسوتێ،ئاگر سوتاندن، هالاو ، کلپە . (٢) نازناوی خاوەنی ئەمدیوانەیە .

حەرەم "حرم": ناوەوەی خانو ، ناوەوەی ژور ، (٢)هەر جیگەپیکی کەپیا ودەبێ بیپارێزێ، ئەوژورو جێگەیەی کەژن و منداڵی لی دەژی لەماڵ دا (٣) ناوکەعبە ،دەوروبەری کەعبە ، حەرەمەین : مەککەومەدینە .

حەقیقی "حقیقی": راست ودروست ، رەسەن، نەژادپاک .

حەقیقەت "حقیقت": نەژادی شت ، بنج وبناوانی شت ، راستی ودروستی .

حەسرەت "حسرت": داخ کێشان، ئاخ وداخ کێشان،حەیف دریغ .

حوسن "حسن": چاکی، باشی ، جوانی .

حەد "حد": (١) شتێک بکەوپێتەنێوان دوشت ولەیەکتری جیایان بکاتەوە ، قەراغی هەموشتێک ، دوایی وکوتایی هەمو شتێک ، سوز ، (٢) توندوتیژی ، تیژی خەنجەروشیر ، (٣) جەزای گوناهکاروتاوانبارلەجەلدەلی دان .

**حەزەت " حضرت "**: (١) نزیکی، دەربار،(٢) وازەییکەبۆ ڕێزگرتن پێش ناوی کەسی گەورەومەزن دەوترێ ودەنوسرێ،حەزرەتی لەولا: نیازحەزرەتی موحەممەد پێغەمبەری خوایت .

**حیکایات " حکایات "**: کوی حیکایەتە : داستان، سەر گوزەشتە ، سەروسەربردەی پێشینیان ، گێڕانەوەی هەواڵ لەبابەت هەرشتێکەوە بێ .

**حیکمەت " حکمت "**: فەلسەفە ، قسەی بەجێ ، ڕاستی و دروستی لەهەموشتێک دا ، دادپەروەری، زانستی، ژیری ودووربینی ، پەندوئاموژگاری .

**حوکەما " حکماء "**: کوی حەکیمە ،زانا ، خاوەن حیکمەت .

**حوجرە " حجره "**: (١) دوکانی بەزاز ، جێگەی قوماش فرۆشتن ، (٢) ژور ،(٣) حوجرەی مزگەوت ودەرس خوێندن، ژوری مەدەرسە یاکاروانسەرا .

**حوقە " حقه "**: قتو ، سندوقی بچوکی جوان کە زێڕ و جەواهیری لەنێودا دەپارێزرێ .

**حەجەر " حجر "**: (١) سەنگ ، بەرد (٢) پیرۆز ، یاقوت .

**حەسادەت " حسادت "**: ئەوکەسەیەکەنەتوانێ دەولەمەندی وبەختیاری خەڵکی ببینی وئارەزوی لەناوچونی بکا ، حەسودی بەخیلی .

**حەشەم " حشم "**: خزمان و کەسان، نۆکەران وخزمەتکارانی پیاو، مەرەکان .

**حەرب " حرب "**: جەنگ ، شەڕ، کێشە .

**حەرەمخانە "حرمخانه "**: حەرەم سەرا ، ژوروسەرای گەورەکان کە جێگەی ژنانە ، شوێنی ژنان.

**حەمد** " **حمد** ": ستایش ، سپاس ، ستایش کردن، شوکرکردن،یاد کردن .

**حیرز** " **حرز** ": (١) جێگەی قایم، پەنا وپەسێو، شوێنی کە شتێکی تێدا بپارێزن (٢) بەهرە، نەسیب ، ئەودوعایەی لەکاغەز دەینوسن و لەگەڵ خویان هەڵی دەگرن.

**حیرمان** " **حرمان** ": ناهۆمێدی، بێ بەهرەبون ، بێ بەش کردن ،

**حیمایەت** " **حمایت** ": ئاگاداری لێ کردن، چاوەدێری کردن، پارێزگاری کردن لەشتێک یا لە کەسێک ، پشتیوانی کردن ،— پاسەوانی .

**حەبیبان** : خۆشەویستان، دۆستان .

**حیفز** " **حفظ** ": پاراستین ، پارێزگاری کردن ، پاسەوانی، بەرگری کردن لەلەناوچونی شتێک ، ئاگاداری کردن لەشتێکتاتێک نەچی ، لەبەکردنیشێعریا هەرنوسین وقسەیێکی تر .

**حزور** " **حضور** ": (١) ئامادەبون، ئامادەکردن، لەنزیک کەسێک دابون(٢) وازەی وشەی رێزگرتنەلەپێش ناوی کەسی گەورە دەوترێ ودەنوسرێ .

**حوب** " **حب** ":وستی ، عیشق ، دڵداری،خۆشەویستی .

**حوباب** " **حباب** ": (١) یلقی ئاو ، گومبەزی ئاو (٢) رو— پۆشی پاولەشیشەیا بلور.

**حوزن** " **حزن** ": خەم وخەفەت ، دڵتەنگی ، کەسەرە

**حوججەت** " **حجت** ": بەلگە، دەلیل ، بورهان .

**حەی** "**حی** ": زیندو، گیاندار ، نەمر، خودا (٢) مار (٣) — گوند، ئاوایی، ئاوەدانی ، قەوم، عەشیرەت .

**حەیدەر**"**حیدر**": (١) یەکێکەلەناوەکانی خەلیفەچوارمی راشدین ، عەلی کوری ئەبوتالیب (٢) شیر ، شیری قەدبارێک .

خ =

**خـالـيـق " خـالـق "**: بەدی هێنەر، دروستکەر، پەروەردگار، خوا، ئافەریدگار، یەکێک لەناوەکانی خوایە.

**خـاتـەم" خـاتـم"**: (١) مور، نیشانە، دوایی هەرشتێـک، ئەنگوستیلە، نقیم، (٢) زاری یار، دەمی یار، شتێک کەلەعاجی فیل وئێسکی وشتردروستی بکەن وگوڵ ووێنەی جۆراجۆری لەسەر بکێشنەوە.

**خـاکستـەر**: خۆڵەمێش، مشکی، ئەوخاکەیەکەلەئەنجامی سوتانی دارودەوەن دروست دەبێ ورەنگی بورە.

**خـام**: خاو، نەگەیشتو، نەگەییو، هەرشتێکی کەدەسکاری نەکرابێ‌ولەسەر تەبیعەتی خۆی مابێتەوە، (٢) پیستی دەباغنەکراو، (٣)کەمەند.

**خـاسـە "خـاصـە"**: تایبەتی، هێزوتوانای تایبەتی ناوەوەی کەلەشت دا هەیە، دژی گشتی.

**خـاتیمـە " خـاتـمـە "**: مس "خاتیم"ە، دوایی.

**خـار**: درک، درو، چەقل، تیغی دارودەوەن، خاروخەس: درک ودال، خاری وەکەنات: درووی وشترخۆر،

**خـەرابـات "خـرابـات"**: مەیخانە، لەبنج دا بەعەرەبی "خربات"ە، " کوی" حربە = خەریبە" یەواتە ویرانەوکاولگـە، لەکون دا بەوما لانەیان ئەوت کەشوێنی مەی نۆشی وشەراب خواردنەوە .ودڵداری کردن لەگەل کەنیزەکان بو، لەزاراوەی سوفیایەتی دا بریتی‌یەلەپلەوپایەی خەرابی ولەناوچونی خووڕەوشتی نەفسانی وحەیوانی، وەجیگەی ئاکارورەوشتی مەلـەکوتی وئاسمانی، ئەوجێیەی کەخواناسان وسالیکان لەزنجیری خووڕەوشت وحالەتەکانی نەفسانی رزگاردەبن وسەرمەستی مەیی یەک پەیوستواتە "وەحـدەت" دەبن، وەخەراباتی بە ئینسانی پوخت وشارەزا ئەڵێن کەگەیشتیبێتە

پلەی بەرزی عیرفان وخواناسی وناسەوەری .

**خدری زیندە** : خدرپیغەمبەر ، ناوی یەکێکەلەپێغەمبەران، لەسەردەمی موسا پێغەمبەردا ژیاوەوهاوریێ بووە ، لەئەفسانەی سامی یان دا ئاوی ژیانی خواردوتەوە هەتاهەتایە نامرێ، لە کوردەواری دا خدریزیندەی پێ دەلێن، ناوی تالیایا ،ئیلیایوهن بووە ، وەلەبەر ئەوەی هەمیشە لەجێگەی تەوسەوزی دادانیشتووە – "خضر" یان پێ وتووە ، هەروەها دەلێن لەگەل ئەسکەندەری گەورەلە ئاوی ژیبان گەراولەخاکی زولمات داسەرچاوەی ئەوئاوەی دوزی – یەوە ولێی خواردەوە ،پێ مەگەیشتەژیانی نەمری وهەمیشەیی،وەلە هەمودەوروزەمانیک دالەبیابان دابەهانای ونبووان ونیووان دەگا و یارمەتی یان دەدات ، قورئانی پیروزباسی کردووە ،لەکەدەرویش وسوفی یان داپایەییکی بلندهەیە .

**خەرامان** : بەنازویشتن، بەنازوفیزبەرێگادارویشتن.

**خەرقە** : ئیلمە، پارچەی جل ، پارچەییکی بچوک لەقوماش جلێک لەپارچەیبچوک بچوکی جۆراوجۆردروستکرابێ، جل وبەرگی دەروێشان .

**خەراج " خراج"**: باج ، ئەومالەیەکەلەباتی بەکارهێنانی زەوی لەبەرهەمی کشت وکال وشتی تروەردەگیرێ.

**خەرقی عادەت** :پێچەوانەی خوورەوشت ، لاچون لەسەخوو رەوشت ، زیادەلەرەوشت .

**خیرەق " خرق"**: کوی " خرقە= خەرقە ( یە : پارچەی جل ،– جل وبەرگی دەورێشان .

**خزمەت** : کارکردن بۆکەسێکی تر ، نۆکەری، خزمەتکاری .

**خەسیس** : چنوک ، چاوچنوک ،بەرچاوتەنگ ، لەچەر،نان – نەخور، نان نەدەر.

**خــزان** : چونەنا وشتێكی تەسک ، لەسەرنگ رویشتن،ڕۆیشتنی چانەوەری بی پی .

**خەتا " خطا "** : تاوان ، سوچ ، نادروست ، تاوان وگوناهێكی بەئانقەست نەكرابێ.

**خەجالەت** : شەرمەزاری، حەیا ، شەرمنی .

**خیتابات ( خطابات "** : وتوویژ ، قسەی روبەروئەوقسانەی روبەروبوكەسێک دەوتری، ئەو قسانەی كەسێک بەیەكێكی تربلی وئەو وەلامی بداتەوە .

**خەتی بوتلان " خط بطلان "** : خەتی ناراست ، دێری ناحەق، خەتی پوچ ، نوسینی ناراست .

**خەندان** : شكوفەی گوڵ ، خونچەی گوڵ ، دەمبەپێكەنین، خوشحال ، دڵخۆش .

**خەلوەت " خلوت "** : تەنیایی هەڵبژاردن ،جێ بەتال ، شوێنی خەوتن (٢) خەزان ، گەڵاریزان، پاییز ، یەكێكەلەچوار ـ كەژی سال ، سێ مانگی پێش زستانە .

**خەلەف " خلف "** : نەوە، نەوەی چاک ، كەسێكەلەدوای كەسێكی ترەوەبی، جێ نشین ، ئەولادی دروستكاروشایان .

**خەلیفە** : جێ نشینی پیغەمبەریائیمام، ئەوكەسەیەكەلەجی كەسێكی تردادەنیشێ، (٣) ناوی سەرۆكی دەولەتەئیسلامی یەكان بولەپاش حەزرەتی موحەممەدەوە تاروخانی دەولەتی عوسمانی .

**خلوسییەت " خلوصیت "** : پاكی، خاوێنی، بی غەشی .

**خوش مەنزەر " خوش منظر "**:خۆش دیمەن ، روح پەروەر ،دیمەن جوان .

**خوسرەوی خوبان** : فەرمانرەوای جوانان ، پادشای جوانان، خوسرەوی پەرویز ، نەوەی ئەنوشیروانی داپەروەرە ، لەسەردەمی ئەودا پیغەمبەری موسولمانان موحەممەدپەیدابو ، خوسرەوپادشاییكی

خاوەن شکوبو، دەولەمەندی وگەنجینەکانی بون بەئەفسانە،دلداری لەگەل شیرین بووە، بەسەرچاوەی چیروکی شیعریلەویژەوئەدەبیات دا.

**خورشیدی تابان** : رۆژی روناک، خۆری تروسکەدار،.

**خورسەند** : خۆش حال ، دلخوش ، شادمان، قانیع بون ، رازی بون .

**خوررەم " خرم"** : دلخوش ، شاد ، خوشحال ،(٢)ئەروتازەو ـ نازدار.

**خوبان** : جوانان ، چاکان ، شۆخان ، دلبەران .

**خەدەنگ** : تیری راست ودریژ، داریکی سەخت وقورس وپتەو، تیرونیزەی لێ دروست دەکری(٢) دارگەز، درەختی گەز.

**خیرەد "خرد"** : عەقل وهۆش ، زانست ، خیرەدمەند: زانا ، هۆشیار، بەنۆش ، عاقل .

**خوتور " خطور"** : یادهاتنەوە، هاتنەوەبیر، شتیک لەبیر کرابێ ویستوەیاد.

**خەواس " خواص"** : کوی " خاصه = خاسسه"یە: خزمان ، کەسان ونیزیکان، گەورەکان وهەلبژاردراوانی قەوم(٢) سود و قازانج ، خەواس بەرامبەری عەوام.

**خومار "خمار"** : ئە وژانەسەروسەرئیشانەی کەدوای مەی خواردنەوە بەدی دێ، دەردی سەروسستی یێکە دوای لەناوچونی نەشئەی شەراب لەئینسان دابەدی دی، حالەتی دوای مەستی .

**خوان** : سفرە، ئەو شتەی نانی لەسەردەخورێ .

**خەلەل " خلل"** : درز، کون ، پەک کەوتنی کارێک،کارێک کەچەتی تێکەوێ وپێک نەیەت ، زیان ولەناوچونی کارێک ،شیواوی بیرورا ، جیاوازی ، مەودای نیوان دوست .

**خيسال** " خصال ": كوى" خصلت = خيسلەت "ە: خوورەوشت ، عادەت .

**خەد** "خد": رومەت ، كولمە ، روخسار ، گونا .

**خەتاوخوتەن** : ناوى كۆنى ناوچەكانى باكورى چينەكە موشكى ئەوناوەبەناوبانگ بووە .

**خونكار**: خوێن رێژ ، ئەوەى خوێن دەرێژێ ، ئەوەى كەسێك دەكوژێ .

**خەيال** : ئەندێشە ، وەهم ، گومان .

**خيلاف** " خلاف ": پێچەوانە .

د =

**دانیش** : زانست ، زانیاری ،عیلم ، دانایی .

**دانی** : نزیک ، نیزیک بو ، دژی"قاصی ـ قاسی".

**دارولحوزن** ( دارالحزن ": مالی خەموخەفەت ، مال وشوێنی کەدانیشتووانی توشی خەوخەفەت بن .

**دەرک** : تێگەیشتن ، گەیشتن بەشتێک ، حالّی بون.

**دیرایەت "درایت"** : تێگەیشتن، زانین ، ئاداربون،شارەزا بون .

**دەلەک** : جانەوەرێکی گوشت خورە ، لەسمورەدەکا وهیندەی پشیلەیا توری گەورەترە ، پیی کورتە ، پیستی یەکجارنەرمە ،رەنگی زەردوقاوەیی هەیە ، ژێرگەردن وسنگی سپی یە ، پیستی بەنرخە ، لەکوردستان دا پەیدادەبێ .

**دەلیل " دلیل "** : بەلگە ، رێبەر ، پیر ، مورشید ، هەمو بەلگەیەک بورون کردنەوەی شت ، حوجەت .

**دلجو** : دلّخواز ، ئەوەی دلّ پەسندی دەکات .

**دولدول** : زوشکی گەورە ، ژوشکی تیرها وێژ ، سیخور ، (٢)بە مانای کارێکی گەورە ، (٣) ناوی ئێسترێکەدەلین "موقوقیس فەرمانرەوای میسربۆپێغەمبەری‌ئیسلامی ناردبوبەیداری وحەزرەتی علی کوری ئەبوتالیب سواری دەبو ، هەربەم‌هۆیەوەبەحەزرتی عەلی یان وتووە شای " دولدول سووار ".

**دەقیق** : بارێک ، نەرم، ورد، (٢) ئارد (٣) کارێک پیاو سەری لێ دەرنەکا ، کاری داپۆشراووشەستم، نوکتەی باریک .

**دود** : دوکەل .

**دەماغ**: مێشک ، شتێکی نەرم ورەنگ بوری کالەناوقاپی سەر " جومجومە"دایە .

دەهـر"دهـر" : رۆژگار ، زەمان، زەمانە ، رۆژگاری بێ پایان.

دەقیقـی : باریکی، نەرمی، وردی .

دەفینـــە : شاراوە، پەنـهان ، پارەیا شتێکی ترکەلەژێرخاکـا شاردرابێتەوە ، گەنجینە ،خـەزێنە .

دور: دور" در" : مرواری درشت .

دورد : خلتـــە .

دیبـــا : جورەقوماشیکیئاوریشمی یە ، قوماشی ئـاوریشمـــی رنگاورەنگ .

دیباچـــە : سەرەتا ، سەرەتای مەبەست ، شەرحێ کەلەپێشەوەی کتێب دابنوسرێ، (٢) روخسار ، رو ، بەعەرەبی" دیباجە"ی پێئەلێن.

دیـــار : کوی دار ، مال ، شار ، سەرزەمین ، هەرێم ، مەلبەند ، ناوچە (٢) ئاشکرا ، دیاری .

دەهـەن : زار ، دەم

دیرینـە : کۆن ، کۆنە ، پێشینە ، لەمێژینە ، قەدیم بون ،بەسالاچو ، پیری لەکارکەوتو .

ر =

**رەجـا "رجـا "**: تکـا کردن، ئومێدکردن.

**رەحمـەت "رحمـت "**: مێهرەبانی چاکەکردن، بەخشین، بەزەیی.

**رەئیـس " رئیـس "**: سـەردار، سەروەر، سەردەستە، پێشـەوا، گەورەی میللـەت.

**رەشـک** : غیرەت، حەسادەت.

**رەم "رم** : (١) رامکردن، هەڵاتن، دورکەوتنەوەراکردن لـە ترسان، رەو، رەوینەوە (٢) پەلامار، هێرش، بەسەردادن، رەمـی ئاهو: سل کردنی مامز.

**رەهـن** : بریتی یەلەوشتەی کەدەدرێتەکەسێک وپارەی لـێ قەرزدەکرێ، نرخی ئەوشتەهێندەی پارکەبێ، قەرزدارشتەکـەی وەر دەگرێتەوەلەپاش ئەوەی قەرزەکەدا داتەوە.

**رەحمـان " رحمـان "**: بەخشەندەومیهرەبان، یەکێک لەناوە- کانی خوای گەورەیە.

**رمـوز**: کوی رەمزە: ئیشارەت، رازی نهێنی داپۆشراو،ئەو بزوتنەوەیەکەلەئەنجامی داڕادەمیزاددەرکی مەبەس دەکا.

**روح**: (١) گیان، رەوان، نەفس، جان،(٢) فەرمانی خـودا وەحی خودا، فریشتە.

**رەوغـەن** : رون، شتێکی شل یانەرم وچەورەلەکەرەیـا دوگیا دەنکی بادام وگەرچەک وزەیتون وشتی تردەردەهێنرێ.

**روقعـە " رقعـە "**: نامە، نوسین، نوسراو، پارچەکاغەزێـک بۆنوسین پامادەبی(٢) جۆرەخەتێکی نوسینە (٣)پارچەی هەموشتێـک (٤) پینەی جل وبەرگ.

**روخنـە** : کون، درز.

**روبـاب** : یەکێک لەئامرازەکانی موسیقای کۆنە، وێنـەی تارە بەلام کاسەکەی بچوکترەولەکوناودوتەلی بووەبەهۆی کەمانچەوە

لیدراوە.

**ریعایەت " رعایت "**: لەوەراندنی مەروما لات،لەوەڕاندنی ئاژەل وپاتالی گیاخورلەلەوەرگادا، (٢)راگەیشتن بەئیش وکاری رەعیەتان، (٣) راگرتنی‌ڕیزومافی کەسێک،دلنەوایی و میهرەبانی، چاکەویا رمەتی دان.

**ریوایەت " روایت "**: چیروک، داستان، گیڕانەوەی مەبەست،خەبەریاحەدیس.

**روحانییەت " روحانیت "**: پاکی وپیروزی، پاریزگاری، (٢) زانایان وپێشەوایانی ئایینی، کۆمەلی روحانیانی ئایینی، ئەوکەسانەی پێیان وایەروحما ددەنیە.

**روکن " رکن "**: (١) بەشی گەورەتروبەهێزتری هەرشتێک ئەندامی گەورە، ئەوەی کەپێی بەهیزبن وپالی وی دەن (٢)پایەو کۆلەکە (٣) گەورەوپێشەوای قەوم.

**ریشتە "رشته"**: رستە، تال، داو، رێزیک شتی هونراوەی وەکومرواری، تەناف.

**رەقیبان** : ئەوکەسانەی مەیلیان بۆشتێک یاکەسیک هەبێ و عاشقی بن، هەریەکەیان رەقیبی ئەوی تریانە، ئەوانەی قسە و کردەوەوبزوتنەوەی خەلکی هەلدەگرن یاتوماری دەکەن.

**ریسوا** : بێ ئابرو، بەدناو، بێ شەرم، شەرمەزاری بەهۆی کاری ناحەزوخراپەوە، ئەوکەسەی کەکاری خراب وناحەزی لێ ئاشکرا بێ ولەلای خەلک شەرمەزاروبێ ئابروبێ.

**ریا** : بەدروخۆپیشان دان بەکەسێکی باش ودا وێن پاک، خۆپیشان دان بەخیرخوا ولەراستیش دا واتەبی، دوورویی،.

**رەزان** : میو، داری تری.

**رەزیل "رذیل"**: ناکەس، پەست، نزم، زەبون.

رەعـــد "رعـــد": هەورەتریشقە، دەنگی هەور.

رەســەدخـانــە: ئەومال وشوێنەی کەئامرازوکـــەرەســــــەی ئەستێرەناسی تێداکودەبێتەوە.

ز =

**زاهیـد "زاهـد"**: تۆبەکار ، ئەوکەسەی وازی لەدونیا هێنا بێ وخەریکی عیبادەت بێ ، پارێزگار ، پارسا .

**زات "ذات"**: خاوەن ، خوداوەندی هەبون وجەوهەری هەموشتێک نەفسی هەموشتێک ، سرشت .

**زاهیـر "ظاهـر"**: ئاشکرا ، دیار ، پەیدا ، نوێنراوە .

**زایـع " ضـایـع"**: بێ بەهرە ، بێ سود ،بێکار ،بەغیروچـو ، وازلێهێنراو ، ون بو ،بـزربـو .

**زاغ** : قەڵەرەشـە ، باڵدارێکی رەشە ، لەقەلەسا بونەبچوکترە ودەنوک وپێی سورە ، لەهاوینا دەچێتەکوێستان وشێنی سارد .

**زانـو**: چوک ، ئەژنـۆ .

**زەمیـر " ضمیـر"**: (١) ناوەوەی ئادەمیزاد ،ناخیدل،ئەندیشە ورازی ناودل ، نیهاد ، دەرون، (٢) لەدەستوری زمان دا ئـەوـ وشەیەک جێگری ناووشەخس دەگەیێنێ ، وەکومن ، تۆ ، ئەو ،ئێمە ، ئەوان .

**زەمهەریـر "زمهرير"**: زۆرسارد ، سەرمای سەخت ، جێگەیەکجار سـارد .

**زەلـەیخـا** : ناوی ژنی پوتیفاری عەزیزی میسربو ، ئەوەی — حەزرەتی یوسفی بەپارەکری، زولەیخا عاشقی یوسف بو بەلام یوسف مەیلی بۆی نەبولەبەرئەوەلای پوتیفاری مێردی بوختانی پێ کـرد تاخستی یەزینداتەوە ، بەلام لەئەنجام دا ،یوسف لەزیندان رزگاری بـو لەوکاتەی زولەیخا پیـربوبو ، رۆژی لەسەررێی یوسف دانیشت وبەفرمێسک وپارانەوەدا وای لێ کردکەلێ خۆش بێ وئیمانیشی بـە پیغەمبەرایەتی هێنا ، ئیتریوسف دۆعای بۆکردوگەنج بووەوشویان بەیەکتری کرد ، لەقورئان دا باسی ئەمرودا وانەکراوە .

**زوهــره " زهـره "**: ناهید، وینوس، نزیکترینی ئەستیرە ـ گەروکەکانەلەزەوی ئیمە، لەپیش رۆژهەلات ولەپاش روژئا ووالــە ئاسمان دادەبیزی، ماوەی بزوتنەوەی لەدەوری رۆژدا "٢٢٥" روژە، دوئەوەندەی عەتاریدوهەندی لەزەوی ئیمەبچوکترە، گۆرانیی فیکر و سەماکەری چەرخ وفەلەکی پەدەلین .

**زەوال " زوال "**: لەناوچون ، لەبەین چون ، دورکەوتنەوە ، پاک بونەوە .

**زومـره " زمـره "**: دەستە، پول ، کۆمەل ، گروە .

**زەرف "ظـرف "**: لەزانستی " سەرف = صرف " دا هەموشتیکــی کەشتیکی تری تیدابێ، ئەوەی مانای " لە"ی تیدایە ،دوبەشە ،جیگە و کات ، (٢) بلیمەتی ، پسیوری (٣) قاپ ، هەموشتیکی کەشتیکی تری بخریتەناوەوە، (٤) حال ، وەزع .

**زەکـات " زکـاه "**: = **زکوە**: خوالاسەوهەلپژاردەی شتیک بــە شتیک لەمال کەبەدەستوروفەرمانی شەرع لەریی خودا بیدەن بــە فەقیروهەژار، لەزاراوەی " فیق ـ فیقە " دابەشیکی دیاری لــە مالەکەدەبێ بیدەن بەهەژاران وئەوانەی خیریان پێ دەشێ .

**زەررە " ذره "**: (١) شتی یەکجاربچوک (٢) هەریەکیک لەوشتە بچوکانەی لەهەوادابلاون ولەبەرتیشکی روژدیاردەبن .

**زیـارەت " زیـارت "**: چونەلای کەسی گەورەوپایەبلندبــو دەست ماچ کردنی، چونەلای شیخان وپیاوچاکان وخواناسان بۆدەست ماچ کردنی، چونەسەرئاراماگاوگۆری پیرانی پیروزوپیاوچاکانــی مــردو .

**زینــەت**: جوان کردن ،هەرشتیکی کەشتیکی تری پێ جوان ـ بکرێ، ئارایش .

**زەنــگ** : (١) ژەنگ ، ئەوشتەیەکەلەئەنجامی هەواوتەرایــی

لەسەرئاسن پەیدادەبێ ، کارکردنی ئولسپژین لەئاسن ،(٢)تیشکی مانگ وروژ ،(٣) کەسی خەلکی زەنگبارکەناوی ولاتێکەلەئەفریقا دانیشتتوانی ئەوی پێستیان رەشە ،(٤) زەنگولە .

**زەنگی** : نیسبەتەبۆزەنگ یا زەنگبارکەناویولاتێکەلە ئەفریقا وخەڵکەکەی پێست رەش، لەکونابەهەمورەشکانیان دەگوت زەنگی، رەشی، قولەرەش ،.

**زیا "ضیاء"**: رۆشنایی ، روناکی، تروسکایی، تریفە .

**زەغەن** : بالداریکەلەقەلەرەشەدەچێ وبچوکترە ، جانەوەری بچوکی وەکو منتبک راودەکاوچولەکەی رەشیشی پێ دەلێن .

**زیکر "ذکر"**: (١) هاتنەوەیاد، وەبیرهاتنەوە،(٢) ناو ـ هێنان (٣) ستایش وسپاس ، نوێژ، ویژدودوعا .

**زمیمە "ضمیمە"**: پێوەلکینەراو ، پێوەنوساو ،پێوەچەسپاو .

**زولفەقار "ذوالفقار"**: ناوی شمشیری حەزرەتی عەلی کوری ئەبوتالیبە .

**زولەمات "ظلمات"**: کوی " ظلمت = زولمەت "ە ، تاریکی دواکەوتویی، نەویندەواری ،پێشینیان وقەدیمیان پێیان وابوکە زولەمات لەئاخری زەوی دایەوسەرەچاوەییکی کەهەرکەس ئاوی ئەم سەرچاوەیە بخواتەوە ژیانی هەمیشەیی دەست دەکەوی ، هەربەمهۆیە وە ئەمسەرچاوەیان ناوناوەئاوی حەیات وگوتویانەکەئەسکەندەر چوبەشوێن ئاوی حەیات دا بەلامنەیگەیشتی وخدرپیغەمبەرلەئاوی ئەوسەرچاوەی خواردەوەوژیانی هەمیشەیی دەستکەوت ،جوغرافیا ـ نوسانی کون زولەماتیان بەقوتبی شیمال داناوە، چون ماوەی شەش مانگ لە سال دالەوشوێنەدا هەواتاریکەوبەبیروباوەری ئەهلی تەسەووف مەبەست لە هەوای نەفسانی وخووڕەوشتی حەیوانی یە ،

**زەفەر "ظفر"**: هیواوئامانج هاتنەدی، بەئاوات گەیشتن ، بەمەزارگەیشتن ، سەرکەوتن .

**زەوق** " ذوق ": (١) چێژ، تام (٢) خوورەوشت (٣) خۆشی، — دونیایی .

**زیللەت** " ذلت ": چارەرەشی ، بەدبەختی، پەستی،گومرایی، ڕێکەوون کردن.

**زیقەتخانە** "ذیقتخانە": مالی تەنگ وتاریک .

**زیشت** : ناحەز، ناجوان ، ناپەسند،روناحەز،بەددیمەن.

**زەیستان** : ژنی تازەزاو،

**زیبا** : جوان ، روجوان ، دڵبەر، دڵرفین ، شۆخ .

**زەقەن** " ذقن ": چالی چەند.

ژ =

**ژولیدە**: خەمگین ، پەرێشان ، لێقەوماو، سەراوژێر. لێقەوماو.

س =

**ساقی** : (١) ئەوکەسەی ئاویا شەراب دەدا بەیەکێکی تر ، ئەوەی لەکۆری مەنوشی دامەی لەپیالەدەکا ودەیدا بەدەستی مەی نوشان ، (٢) لەزاراوەی سوفیایەتی دارابەری راستەقینە ، "مورشیدی حەقیقی" کەئەمەخواخویەتی : وەکولەقورئان داهاتووە "وسقاهم ربهم شرابا طهورا" ، (٣) پیری پوخت و شارەزاکەفەیزوبەهرە بەمریدەکان دەگەیەنێ .

**سالیک " سالک "** : رێبوار ، پەیرەو ، زاهید ، سۆفی ، دەروێش ، ئەوکەسەی دەروا ، ئەوکەسەی رێیەک دەگرێتەبەروبەورێیەدا دەروا ، لەزاراوەی سوفیزمدا ئەوکەسەی کەبەرێنوینی پیرومورشیدبەریی خواناسی ویاریزگاری دابروا وسلوک بەیتی یەلەگەران لەپلەو پایەی وجوددا بۆگەیشتن بەراستی ودروستی ، لەمەرجەکانی ئەو بریتی یەلەرەنج وزەحمەت وگۆشەگیری وعیبادەت وشەونەنوستن ودورکەوتنەوەلەهەوای نەفس ، بەسالیکان ئەهلی سلوک وئەهلی تەریقەتیشیان پێ دەلێن .

**سالح "صالح"** : چاک ، دروستکار ، راست وکردەوەچاکە .

**سامان** : دەولەت ومال ، ئەسبابی دەولەمەندی ، (٢) رێک و پێکی ، جوانی (٣) نیشانەوئەاندازە ، (۴) هێمنی ولەسەرخۆیی ، (۵) هەموبەرهەمێکی ئەدەبی وهونەری (۶) ناوی کەسێک بوکەبنەمالەی پادشایانی سامانی دروست کرد .

**ساغەر** : جام ، پیالەی شەراب خواردنەوە ، کاسەیەک بۆمەی خواردنەوەکەلەبلوریا زێروزیۆیا شتێکی تردروست کرابێ ، لە زاراوەی سوفیایەتی داشتێکی کەلەودانوری غەیبی ونهێنی ببینن ولەواتا ومەعنەویات بگەن ، دلی خواناس وعارف .

**سـاری** : (١) كاركردن لەشتێك بەجۆرێك كەبەھەموڵاییك بلاو ببێتەوە، (٢) ئەوەی بەشەودەروا ، شەورەو ،دەرچون لەودیو ،لـــە زاراوەی پزشكیدا نەخۆشی یەك لەكەسێكەوەبەكەسێكی تربگا .

**سالار**: سەروك ، سەردار ، رەئیس ، سەرۆكی میللەتە گەورەی قەوم ، گەورەوپێشرەوی كاروان یا لەشكر ، قافلەسالار ،لەزاراوەی كشت وكال دا وەرزێری ئاگاداروكارامەكەبەكاروبار ی زەوی وئـاو داشتن و كشت وكال رابگا .

**ساكیـن " ساكن "**: ئارامگرتو ، بێ بزوتنەوە ،نیشتەجێ، موقیم، دانیشتو .

**سەبات " ثبات "**: قایمی، راست ودروستی، نەگۆریـــن، بیرورا نەگورین .

**سەرراف " صراف "**: (١) ئەوكەسەی كەپارەی ساغلەپارەی قەلب جیا دەكاتەوە، زێرناس ، (٢) ئەوكەسەیەكەپارەدەگۆرێتەوە ، ئەو كەسەیەكەبازرگانی وكرین وفروشتن بەپارەدەكا .

**سەرف " صرف "**: زانستی ییكەبەبابەت پیشتیاقی وشـەی عەرەبیەوە (٢) بلاوكردنەوە ، خەرج كردن، خەرج كردنی مال وپـاره (٣) دەرهێنانی شتێك یا كەسێك لەجێكەییك .

**سەر "سر"**: راز ، نهێنی ، نهینی دەرون ، شتی داپۆشراوو نەبیزاو .

**سەرمایە** : پارەوپول ومالی بازرگانی،ئەوەی ئالـویری پێ دەكرێ .

**سەمەر " ثمر "**: بەر ، میوە ، .

**سەفینە " سفینە "**:كەشتی، پاپـور .

**سەلات " صلاە "** : نـوێــژو پارانەوەلەلایەن بەندەوەلـــە

خودا ، ڕەحمەتی خوا بەبەندەکانی .

**سەلا" صلا"**: وشەییکەبۆبانگ کردنی خەڵکی بەکاردەهێنری، بانگ کردنی خەڵک بۆکارێک ، نویژکردن، (٢) نان خواردن .

**سەرڕشتە** : سەری هەوادا ،ڕێگەی کار ، سەرکەوتن وزانینی کار شارەزابی وکارامەیی لەکاردا (٢)دەفتەری حیساب .

**سەدارەت " صدارت "** : جێگەی بەرز ، گەورەیی،پلەی سەرۆکی وەزیران، سەدری ئەعزەم، بالانشین .

**سیلاح" سلاح"**: چەک ، هەموئالەتێکی کەلەشەڕدا بەکار بهێنری، تەقەمەنی، .

**سیفات " صفات "**: کوی" صفت" = سیفەت "ە: چۆنیەتی ئەو شتەیەکەچۆنیەتی شتێک یاکەسێک دیاری بکا .

**سوجدە " سجدە "**: نیوچاوان کەیاندنەسەرزەوی بۆمەبەستی عیبادەت وخۆبەچوک ونزمپیشان دان ، کرنۆش بردن .

**سوحبەت " صحبت "** : هاودەمی، هاوڕێیەتی، وتوویژ ، گوفتوگۆ .

**سوبحان** : بەپاکی یادی خوداکردن، حەزرەتی سوبحان : خودای پاک وبێ عەیب ، سوبحانی: خودایی، ئیلاهی .

**سولوک " سلوک "**: گرتنی ڕێگەیێک ولەسەری ڕۆیشتن ، — ڕەفتار ، ڕەوشت ، ڕێڕەو ، بوتەریقەت بەکاردەهێنرێ، .

**سریشک** : فرمێسک ، ئەسرین ، دلۆپەدلۆپەی ئاوی چاوکە لەکاتی گریان دادەرژێتەخوارەوە .

**سوفی " صوفی "**: دەروێش ، شێخ، مرید، ئەوکەسەیەکە پەیڕەوی تەریقەتی سۆفی " سوفیزم " دەکا ، پەشمینەپۆش . یەکەم کەس کەپێیان وتووە سوفی ئەبوقاسمی سوفی بووەکەلەسالی ١٦٠ کۆچی مانگی ، کۆچی دوایی کردووەویەکەم کەس کەواژەی سۆفی لە

کتێبەکەی خویا هینا وەعەمروبنی بەحری جاحیزبووەکەلەنیوەی یەکەمی سەدەی سێهەمی کۆچی دا ژیا و . .

**سروروسور**: کەیف وخۆشی ، شایی وزەما وەند ،شادی وکامەرانی، گوشادی ودڵخوشی .

**سورە**: فەسل یا پارچەیێکی سەربەخۆلەکتیب ،بەشێک یا پارچەیەک لەقورئان ، هەرکاملەسەدوچاردەفەسلەکانی قورئانی پیرۆز ، سورەی یوسف : پارچەوبەشێک لەقورئان کەباسی حەزرەتی یوسف دەکا .

**سەیقەل "صیقل"**: مشت ومال کردنی شیروخەنجەر ، پاک کردنەوەوتیژ کردنوبریقەدان بەشیروخەنجەرە .

**سەفسەتە " سفسطە"**: وەرگیرا و لەیونانی، بەلگەوقیاسی باتل ونادروست بۆپێچەوانەنیشان دانی راستی .

**سیفە " صیفە"**: چور، ئەسل ، شیوەی هەرشتێک لەقالبی ریژراودا ، لەزاراوەی سەرفی عەرەبی دا شیوەوشکلێک کەبەکەم وزیادکردنی پیتەکان یا گورانی حەرەکەکان دەدری بەواژە،وەکو سیغەی موفرەد، سیفەی تەسبیە، لەزاراوەی فیق داکاتی معامەلە و کرین وفروشتن وبەستنی نیکاح بەسەرزمانی دادەهینن وە ، بەلگەی رازی بونی هەردولایە ،(٢) ژنێکی کەهەمیشەیی نەبێ ، ژنێکی کە بۆماوەییکی کەم ودیاری کراولەپیاوێک مارەبکرێ .

سیفەی تەرازی : چونیایەتی رازی بونی دەکەس .

**سەدەف " صدف"**: گیاندا رێکی بچووکەلەنێوئاودادەژی، لاشەی لەنێوتویکلێک دا یەپیی دەلێن " سەدەف" ئەوگیاندا رەچەند جۆری هەیە ، ئەوگیاندا رەچەند جوری هەیە ، بەناوباناگترینیان سەدەفی مرواری یەکەمایەیەک لەنێولەشی خۆی دادینیتەبەرهەمئەوما یەیەوردەوردەرەق دەبێ ومرواری لێ پیک دێ، بۆدروست کردنی

ئەنگوستیلەوزیوەروهەندێ شتی جوان ورازاوەلەتویکلی ئەو گیاندارانەسودوەردەگرن ،سەدەفی سەدوچاردەلیزگەکیننا یەلە قورئانی پیروزەکەسەدوچاردە سورەی هەیە ، سەدەفی ئاگرین کینایە لەخورەکەسەدەفی فەلەک وسەدەفی روژیشی پێ دەلێن ، سەدەفی مرواری لەئیقیانوسی گەورەوئیقیانوسی هێندوخەلیجی فارس دا ـ بەزوری هەیە .

**سەمی یی " سمیی "**: هاوناو، هاوتا .

**سەلەف " سلف "**: رابردو، لەرابردودا ،هەرکەس کەپتر ژیابێ لەباوکان وخزمانی کەسێک .

**سەداوسەیتە " صداوصیتە "**: دەنگ وئاواز، بانگ و ئاوازیک کەلەکێویا شوێنیکی ترەوەدەنگ داتەوە ودوبارەببیسرێتەوە .

**شورمە** : کل ، چەشنەخولێکی نەرم ورەش ووردەبورەش کردنی برژانگ ورشتنی چاوبەکاردەهێنری .

**سوبحی شەمەل " صبحا مل"**: بەربەیانی ئارەزو، بەرە بەیانی ئاوات .

**سەید"صید"**: راو، شکار، راووشکار، نیچیر .

**سولتان " سلطان "**: (١) فەرمانرەوا ، پادشا ، مەلیک ، (٢) بەلگە، هێزوتوانا .

**سەییاد " صیاد "**: راوکەر، راوچی، شکارچی .

**سەرشەفکەندە**: شەرمەزار، سەرنەوی .

**سەعادەت** : بەختیاری، کامەرانی، خۆش بەختی ، دژی بەد بەختی .

**سەلەر "سقر"**: دوزەخ .

سەنا "ثناء": ستایش ، مەدح.

سەیار "سیار": گەروک ، کاروان ، قافلە .

سیم تەن : لەشی سپی زیوین ، بەدەنی سپی وەک زیو .

سیما : وێنە، روخسار، نەقش، شێوە، شکل .

سەبیل "سبیل": رێگە، رێ، رێگەی ئاشکرا .

سەرچل : (١) شێت وسەرسەری، (٢) سەرلق .

سرایەت "سرایت": بروانە ساری .

سەبا "صبا": (١) بای شەماڵ ، بایەک کەلەرۆژهەلاتەوە شنەی دێ .

سەفەر "سفر": بریتی رێگە، لەشارێک بۆشارێک چون .

سەعی "سعی": (١) تێکۆشان، کارکردن، (٢) چون ، رویشتن ،(٣) ئەوراکردنەیەلەکاتی حەج دا لەنیوان" سەفاو مەروە".

سەنەم "صنم": بوت .

سفیدەی سوبح:روناکی بەیانی، روناکایی بەرەبەیان.

سەبو: گوزە .

سەحیفە "صحیفە": نامە، لاپەرەی کتیب ، کتێبی بچوک، گۆفار، رۆژنامە.

ستون : کۆلەکە .

سەعب "صعب": سەخت ، کاری سەخت ، ئەوشتەی بەسەختی پێتەدەست .

سەفا "صفاء": سافبون ،پاک وروناک ، پاکی وخاوێنی، رەوشەنی ، روناکایی، برەو، خۆشی وشادی، یەک رەنگی.

سـەهبـا " صهبـا " : پیـالّـە ، پیالّـەی شەراب ، جام .

سـەودا : ڕەشایـی ، تاپـۆ ، ڕەشـایی خەڵـک ، کەس ،ڕەشاییی شـارێک کەلەدوردێتەبەرچاوە .

ش =

**شاهید** " شاهد ": بوککچی جوان ، مەعشوق ، دلبـــەر ، (٢) گەواه ، ئەوەی رودا وو کارەساتێک بەچاوی خۆی دەبینـــێ و گەواهی دەدا ، حازربون.

**شـام:** (١) سەرەتای شەو ، ئەوکاتەی کەتاریکی دەست پێ دەکا ، کینایەتە بۆڕەشی وتاریکی(٢) خواردەمەنی ئێوارەوشەو (٣) وڵاتی سوریە، شاری دیمەشق .

**شامات** : کۆی " شام" ە-بڕوانە شام (٢) کۆی " شامە"یە خاڵ ، (٣) شامرد، مردنی شا ، زاراوەییکە لەیاری شەترەنج بــە کار دەهێنرێ ، (۴) ناوچەییکەسەربەمەهاباد .

**شەرارە** : بڵێسە ، پڕوشکە ، ئەوەی لەئاگرەوەبۆهەوا بــەرزـ دەبێتەوە ، قرچە .

**شەمس** " شمس ": خۆر ، رۆژ ، شوعلە ، بڵێسە ، گڕ ،زمانــەی ئــاور.

**شەوق** "شوّق": ئارەزو ، مەیل ، تاسە ، ئیشتیاق،رەغبــەت ، بیرکردن ، یاد ، نیاز ، (٢) روناکی ، تیشک .

**شەعر**"شعــر" : مو ، مۆی ئادەمیزاد ، توکومۆی ئاژاڵ .

**شەوی قەدر**: شەوی عیبادەتومانگی قەمەری، سی شــــەوی دوایی مانگی قەمەری کەمانگ دیارنابێ ،شەوێکەلەمانگی رەمەزان دا ، شەوی پارانەوەیە ، قورئانی پیرۆز ، لەوشەوەدابۆپێغەمبــەر هاتۆتەخوارەوە .

**شەریف** " شریف ": خاوەن شەرەف ، بەرێزوبەحورمــەت .

**شەرەفیابی** : بەخزمەتکەسێکی گەورەگەیشتن.

**شەکیب** : سەبروئـارام .

**شهلی:** نیسبەتەبەشبلە، لەئاوایی‌یەکانی "ما وراء لنهر".

**شورب "شُرْب":** خواردنەوە، ئاوخواردنەوە.

**شەجەر "شَجَر":** دار، درەخت.

**شەعیر "شعیر":** جۆ، شەبیهە، وێنە.

**شەفیع "شَفیع":** تکاکار.

**شەکوە "شکوه":** گلەیی، سکاڵا کردن، شکایەت (٢)جۆرە نەخۆشی‌ییکە.

**شوهود "شهود":** کۆی شاهیدە بڕوا نەشاهید.

**شیعر "شِعر":** قسەی بەکێش وقافیەوهۆنراوە، ئەوقسەیەی کێش وقافیەوخەیاڵی تێدایە.

**شیعار "شِعار":** درۆشم، وێنە، عەلامەت

**شەهد "شهد":** هەنگوین.

= ع

**عالەم " عالَم "**: (١) جیهان ، خەلق ، (٢) فەلەک ، ڕۆژگار ، دونیا وئەوەی تییدایە .

**عار**: نەنگ ، شەرم ، عەیب .

**عاریز " عارِض "**: (١) پێشان دان ، ڕوداو ، سەردەستەی لەشکر ، پەیدا بون (٢) ڕو ، روخسار ، ڕومەت ، دەموچاوە .

**عەبەس " عَبث "**: کاری بێ هودە ، کاری بەسود ، کردنی شتێک کەسودی تێدا نەبێ .

**عەسەس " عسس "**: کۆی " عاس "ە (١) پاسەوانی شەو ، شەوگەرد ، ئەوەی شتەودەگەڕێ بەمەبەستی پاسەوانی ، (٢) دز .

**عیسمەت " عصمت "**: خۆپاراستن لەگوناه ، تاوان وگوناەو نەکردن ، ڕێ گرتن لەخراپە ، پاکی .

**عەسا " عصا "**: گۆچان ، ئەودارەسەرخوارەیەکەلەکاتی ڕۆیشتن دابەدەستەوەدەیگرن ویا ریدەی رۆیشتن دەدا ، عەسای موسا : گۆچانی حەزرەتی موسا .

**عیسیان " عصیان "**: سەردانەنواندن ، یاخیبون ، بەقسە نەکردن ، فەرمان نەهێنانەجێ ، غەزرین .

**عەسر " عصر "**: (١) کاتی دوای نیوەڕو تا رۆژئاوا ، (٢) ڕۆژگار ، خول ، چەرخ ، دەور ، سەدە ، دەهر ، (٣) گوشینی شتێک بۆ مەبەستی ئەوەی ئاویا شیرەی دەربهێنرێ .

**عوشرەت " عشرت "**: دوستایەتی ، تێکەڵ بون ، ژیان لەگەڵ یەکتری دا ، ژیانی خۆش ، ژیانی بەختیاری .

**عەقار " عقار "**: ماڵ ، کەرەسەی ناوماڵ (٢) ئاووزەوی ـ کشت وکاڵ .

**عوقار " عقار "**: (١) ماڵ ، کەرەسەی ناوماڵ ، ماڵی

هەڵبژێردراو، (٢)شەراب ، مەی .

**عەرسە "عرصە"**: حەوشە ، گۆڕەپانی ناوخانو ،گۆڕەپانی پێش قەسروباڵەخانە ، مەیدان .

**عەقڵ "عقل"**: هۆش ، ئەوهێزوهەستەیەلە ئادەمیزاداکە جوانی، ناشیرینی، کاری چاک وخراپ لەیەکتری جودادەکاتەوە ، عەقڵی کول : عەقڵی تەواو .

**عینان "عِنان"**: جڵەو ، ئەو پەتەیەکەبەلغاوی ئەسپەوەیە وسوارپەدەستی دەیگرێ .

**عینایەت " عِنایت"**: ڕێ پێشان دان ، پاراستن ، دەست گرتنی یەکێک لەپێناوی ئەوەی لەکارێ داسەربکەوێ، وردی لەکار کردن دا .

**عەتتار "عَطّار"**: عەترفرۆش، ئەوکەسەی عەترودەرمانی بۆن خۆش دەفرۆشێ .

**عیقد "عِقد"**: (١) ملوانکە ، گەردانە ، گەردن بەند ،عیقدی سورەییا ( عِقدثُرَّیا ): چەند ئەستێرەی روناک وتروسکەداركەبە شێوەی ملوانکەدیاری دەدەن وشێوەی گەردن بەند،پێک دێنن،پەورین عیقدی مونەززەم " عِقدِمُنَظَّم": ڕستەرێک وپێک ، ڕستەمرواری رێک وپێک .

**عیشوە**: کاری داپۆشراو ، کاری نادیاری، ناز ، دڵبەری،ناز فرۆشتن .

**عوقبا "عُقْبَی"**: جەزا ، سزای کردەوە ، دوایی هەرشتێک دوایی هەرکارێک ، ئاخیرەت ، رۆژی دوایی ، رۆژی لێ پرسینەوە ، دنیای دیکە .

**عەد (عَدّ"**: ژماردکردن، بژاردن ..

عوسات " عَصات ": كۆی" عاسی ـ عاصِی": گوناهكار، ـ تاوانبار، خاوەن گوناح .

عەدالەت " عدالت ": دادگەری، بەئینساف بون.

عەقرەب " عَقْرب ": دوپشك ، ناوی بورجی هەشتەم لە دوازدەبورجەكانیئاسمان .

عورزە "عرضە":لێ هاتویی،هەیمەت ، هێزوتوانایی،(٢) مەكروفێڵ .

عود: (١) دار، لقێكی لەدرەخت جودادەبێتەوە،(٢) ناوی یەكێك لەئامزارەكانی موسیقایە (٣) ناوی درەختێكەلەهێندو-بیرمانی دەڕوێ، دارەكەی قاوەیی ڕەنگ وبون خۆشە، لەئاوری ـ داوێن بۆ ئەوەی بونی خۆش بێت، عودی قوماری:جۆرەعودێكە ، نیسبەتەبۆ" قومار" یا " كۆمار" ناوی شارێكە لەولاتی هێندوستان

عەجوز "عجوز": پیرێژن ، ژنی پیر،ژنی بەسالاچو .

عەلایق " عَلائق": كۆی " عەلاقە " . علاقە " بەهەمو شتێكی پەیوەندی بەئادەمیزادەوە هەبێ وەكومال ومندال ، پێوەندی دۆستایەتی، خۆشەویستی، عیشق ، ئەوین .

عەفو "عَفو": لێخۆش بون ، لێ بوردن ، بەخشین، لەگوناهی یەكێك خۆش بون .

عەدو "عدو": دوژمن .

عید: جەژن ، رۆژی جەژن ، هەررۆژێكی كەدەبێتەمایەی خۆشی وشادی كۆمەڵە، كەسێك . عیدەنیا : لەجەژنی ئێمە .

عیرفان " عِرفان": ناسین، خواناسی، ناسەوەری،عیرفان بەمانای گشتی شاوەزایی وئاگادار بون لەوردەكاری ونهێنیەكانی شتێكە ، بەرامبەری زانستی رواڵەتی وچینایەتی، بەوێنەدەڵێن

فلان كەس پزشكێكی عاریفە ، واتەهەربەنوسراوەوخوێندنەوەرازی ـ نابێ، یا فلان عارف ، چازان وقسەزانێكی عارفە ، واتەتەنیا بە لاسایی كردنەوەی رواڵەتی قانیع نابێ، جوانی ووردەكاری قسەـ زانی وچازانیفێربووە ، عیرفان بەمانای تایبەتی، دوزینەوەوبە دەست هێنانی راستی شت ،بەشێوەی دیتن ودۆزینەوە ،وەبەمهۆیەوە سوفیایەتی واتە تەسەووف لەبنەرتا یەكێك لەتروسكەكانی عیرفانە سوفیاتی نەحلەشێوەورێگاورێبازێكی كیردەوەیی یەكەسەرچاوەكەی لە عیرفانەوەیە، بەلام غیرفان مانایەكی گشتی وتێكرایی ترە، كەبریتی یەلەسوفیایەتی ونەحلەكانیش ، دەگرێتەوە، بەعیبارە ـ تێكی ترنیسبەتی نێوان سوفیایەتی وعیرفان بەقەولی مەنتیقیان. بەومانایەبۆی هەیە ئینسانێك وكەسێك عارف بێ بەلامسوفی نەبێ، هەر وەكوبۆی هەیە كەسێك بەرواڵەت چوبێتەناورێگەورێبازی ـ تەسەووفەوە، بەلام لەعیرفان وخواناسی بەهرەیەكی وەرنەگرتبێ، جاری وایە دیومانە واژەی عارفیان لەمەعنادابەرزتروبەرێزترلە واژەی دەروێش وسۆفی بەكارهێناوە.

**عناسیر "عَناصر"**: (١) ماك ، رەگەز، ریشە، بنەرەت ـ (٢) چوارعونسوری پێشینان ، بریتی یە لەئاو،با،خاك،ئاگر.

غ =

غـايـب " غـائـب ": نادیار ، دورلەپێش چاو ،لەجێگەنەبون، ناپەیدا ، ئەوکەسەیەکەئامادەنیەولەجێیەکی ترە .

غـافـڵ "غـافـل": بێ ئاگا ،ناهوشیار ، ئەوەی زوشتی لـــە بیردەچێتەوە ، بێ خەبەر ، فەراموشکار ، ئەوەی لەگوێی گـــادا ـ نوستووە ، وئاگای لەخۆی نیە .

غـارەت " غـارت ": تالأن کردن،بەتالأن چون ، بەسەردادان، هێرش بردن .

غـایـەت " غـایـت ": دوایی، دوایی هەرشتێک،مـەبـەسـت ، ئاوات ، ئامانج ، ئارەزو .

غـــەزەل "غــزل": جۆرەشیعرێکە لەروی روخسارەوە هـەمــو دێرەکانی لەسەریەک کێشی عەروزی ویەک قافیەیە ، ژمارەی دێرە ـ کانی لەحەوت کەمترولەپانزدەزیاترنیە ، بەلأم لەروی ناوەروکەوە باسی دلّداری وعیشقبازی یە لەگەلّ ژنان دا (٢) هەموقسەیەکیجوانی ئەدەبی کەبۆویسف ودلّداری وئەویندا ری لەگەلّ ژنان دادادەنـری ، (٣) قوماشێکی نەرمی ئاوریشمی یە حەریق دەلّـێ :
کەواپارچەی غەزەل دەبرِی " حەریق" ئەمرۆلەدیوانت .
دەلّێ هەرچاوەرِێ دەستەخەیاتەی زولّفی تاتاتم .

غـەزال :مامز، ئاسک .

غـەوغــا : (١) خەلّکێکی زۆری تێک چرِژاو، خەلّکی پەستـــی ئاژاوەچی ، هەراوهەوریا ، دەنگ وسەدا لەکاتی شۆرِش وجەنگ داکـە خەلّکی بەگژیەکدا دەچـن .

غینــا " غنــاء ": (١) گۆرانی ، ئاوازی خۆش (٢) دەولّەمەـ ندی ، خاوەنی ماڵ وسامان .

غـەفلّـەت " غفلّــت ": فەراموش کردن، لەیادبردن،فەرا ـ مۆشکاری، بێ خەبەری، سستی وکەمتەرخەمی،بێ موبالاتی .

غـولـغـول " غلـغـل ": نـاوی دەنـگ دەنـگ وسەدای بالّداران،
هەرا وهوریای تێک چرژاو ، دەنگی جۆشینی ئاو یا هەرشتێکی شل .

فـوسـه " غصـه ": خەموخەفەت ، ئەوخەفەتەی گەرودەگـرێ،
خەموخەفەت لەدڵ دا ڕراگرتن .

ف =

**فـانـي**: نەبون ، لەنا وچو ، نابود ، بەرامبەری باقـــی (٢) ناپایەدار ، بێ دەوام ، ئەوکەسەی کەلەڕێی ناسینی خواوگەیشتــن بەدل ودڵخوازلەخۆی ببورێ ولە مەعشوق دا فانی ببێ بۆئەوەی ـ بەقای دەست کەوێ ، پیری بەسالاچو ، پیری کەوتو ، دنیای مـاددی کەناپەیدا روبێ دەوامە .

**فـاسیــق " فـاسـق"**: گوناهکار ، تاوانبار ،کردەوەی ناراست.
(٢) پیاوێک لەگەڵ ژنی بەمێردحەزلێ کردن ودۆستایەتی بکا .

**فـانـۆس** : چرایێکەلەمەعدەن وشیشە یاکاغەزیاشتێتوڕوست دەکرێ، چرایێکەبۆروناک کردنی ماوەی زۆر لەژورمنارەیاجێ تــر دای دەمەزرێنن .

**فـاعیـل** : بەجێ هێنەر ، کردنی کارێک، کەسێک کەکـارێـک ئەنجام بدا ، فاعیلی موختار : بەجێ هێنەروبەرێوەبەری کـارێـک کەکارەکەی لەژێردەسەلات وئیرادەی خۆی دابێت، ئەوکەسەی کارێک بەدەسەلات وئیرادەی خۆی بەرێوەببا وئەگەرنەیەوێ ئەنجامی نەدا .

**فـەتـح " فـتـح"**: کردنەوە ، رزگارکردن .

**فـەسـاحـەت "فـصـاحـت"**: رەوانبێژی ، دەمەوەری ، زمانیتیژ ، زمانی گەرم ، لەزانستی بەدیع دامانای ئەومیەکەقسەلەهەموکـەم وکورِی یێک دوربێ لەرِوی سفتی وشەو بەهێزی تەعبیرەوە .

**فـەتتـاح "فـتـاح"**: ئەوەی یەکجارکاری خەڵک ئاسان دەکـا ، ئەوەی خەڵک سەردەخا (٢) یەکێکەلەناوەکانی خودا ، کارگــــوشـا ، یاریدەدەر ، حاکم ، داوەر .

**فـەنـا "فـنـاء"**: نەبون ، نەبونی ، نابودی ، دژی بـــون.

**فـەرەح "فـرح"**: شادی ، شادمانی ،خـۆشــی .

**فیـراق " فـراق"**: جودا بونەوە بەیەکتری، جودایی، دوری ، شەوی فیراق ، شەوی لەیەکتری جودا بونەوە ، ئەوشەوەی دڵــدارو دڵبەرپێکەوە نەبن .

**فـەسـل "فصل "**: (١) جوداکردنەوە ، پارچەکردن، بـڕیـن (٢) قەدەغەکردن لەنێوان دوشت ، ئەو جێیەی دوئیسقان پێــدا دەگەنەیەکتری، (٣) بەشێک یا پارچەیێکی سەربەخۆلەکتێب ، (۴)کەژ ، وەرز ، یەکێک لەچوار بەشەکەی ساڵ کەبەهاروهاوین وپاییروزستانە.

**فـەتـتـان "فتان"**: زۆرفیتنەئەنگێـز ، زۆرجوان ودڵرفێــن کەبەنازوجوانی روشەیدابکا ، (٢) شەیتان(٣)دز ، ریگر .

**فیتـرەت "فطـرت "**: سروشت ، تەبیعەت ، خووڕەوشتی سروشتی ئادەمیزاد .

**فـەیـز "فیـض "**: ئاوی زۆر ، لافاو ،شتی زۆر ،دیاری زۆر ، — بەهـرە .

**فـەییـاز "فیـاض "**: (١) ئاودار ، سەرچاوەی پرلەئاو ، (٢)— جەوانمەرد ، کەسێ چاوتێروسەخی تەبیعەت .

**فــرزەنـد " فـرزنـد "**: منداڵ ، کوڕیاکچی پیاووژنێک کـــە لەمولەوبێ .

**فـەریـد " فـریـد "**: یەکتا ، تەنیا ، بێ هاوتا ، بێ وێنــە ، گەوهەری یەکتاوبەنرخ، گەوهەرێک کەلەناوگەردنبەندوملوانکەدا جێێ بکەنەوە .

**فـەلـەک "فلـک "**: چەرخ، گەردون، مەداری ئەستێرەکــان، ئاسمــان .

**فـەلـەکـول ئـەعـزەم " فلک الاعظـم "**: ئاسمانی گەورە .

**فینجـان** : قاپێکی بچوکلەچینی یابللوردروست دەکرێ بــۆ خواردنەوەی چایی یاقاوە بەکاردەهێنرێ .

**فەزلە " فضلە "**: پاشماوە، پاشماوەی شتێک ، پاشماوەی تەعامو خواردەمەنی(٢) سەرنویلک ، سەرگین .

**فوزەلا " فضلا "** : زانایان، دانیشمەندان ،هونەرمەندان.

**فەوات " فوات "**: مردن، مەرگ، نەمان، نەبون، تێپەر بونی وەختی کارێک ، رابردنی وەختی کارێک ، فرسەت ،دەرفەت .

**فەوج**: دەستەدەستە، پۆل پۆل ، گرۆگرۆ .

**فیلواقیعە " فی الواقعە "**: لەراستی دا .

**فیوزات " فیوضات "**: کوی " فیض = فەیزە ": بڕوانە فەیز .

ق =

**قـاسـی** " **قـاصـی**" : دور ، دوربو ، دوربوەوە ،دژی دانی .

**قـامـەت** "**قـامـت**": بالا ، قەد ، بەژن ، ئەندام ، بڵنـــدی لەشی ئادەمیزاد (٢) تەکبیروشەهادەو هەموشەووشەوتەعبیرانەی کە لەپاش بانگی نوێژکردن وسەرەتای نوێژدا دەوترین .

**قـافڵـە**" **قـافلـە**": قافڵ : کاروان ، کۆمەڵێک خــەڵـــک کەبەیەکەوەسەفەربکەن ، قافڵە سالار ، سەرقافلە ، سەرۆکی کاروان.

**قـاپـی** : دەرگا ، بارگا .

**قـەسـوەت** " **قسـوت** ": سەختی ، ڕەقی ، دڵ ڕەق بون ، بەزەیی نەهاتنەوە ...

**قـوتـب** " **قطـب** ": (١) وەلی ، شێخ ، پیر ، سەرۆکی میللـــەت (٢) لەزاراوەی جوغرافیادا هەریەکێک لەدولاکەی میحورەی زەوی کــە قوتبی باکوری وقوتبی جنوبی پێ دەڵێن (٣) ناوی ئەستێرەییکـــــە لەنێوان جەدی وفەرقەدان دایە ورابەری قەبیلەیە .

**قـورب** " **قـرب** ": نزیک ، نزیکی ، دژی دوری.

**قـولـلاب** " **قـلاب** " : چەنگاڵ ، ئالەتێکی مەعدەنی سـەر ـ چەماوەیە بۆماسی گرتن بەکاردەهێنرێ .

**قـودسـی**" **قـدسـی**": نیسبەتەبوقودس ، ناوی ئیسلامی شـــاری ئورشەلیمە ، بەهەشتی ، پاک وپیرۆز ، قودسیان: کۆی قودسی،فریشتــە کان ، دروستکاران ، راستان .

**قـومـری** : باڵندەییکەلەکوتربچوکترە ، بەجوتەلەگەڵ یەکتری دا دەژین ، گۆشتی زۆرخۆشە .

**قـوت** : (١) خواردن ، خواردەمەنی ئەوشتەی کەئادەمیـــزاد دەیخوا ، (٢)تـاک .

**قـیـدەم**"**قـدم**": پێشینە ، کۆن ، دێرینە ، پێشینەلەکارێک دا ، دژی " حدوس ــ حدوث".

**قيـا س** : ئەندا زەگرتن ، بەرا مبەركردنی شتێک لەگەڵ شتێكی تر ، كەوەک یەک بچن ، بەرا وردكردنی دوشت لەگەڵ یەكتر (٢)گومان.

**قـەنـا عـەت " قنـا عـت "** : را زی بون بەبەش ، را زی بون بە كەم ، بۆوێنەدەڵێن فلان كەس قەنا عەت دەكا ، وا تەبەبەشی خـــۆی قا نع ودڵخۆش ورا زی یە .

**قـەمـەر " قـمـر "** : ما نگ ، ڕوی ما نگ

**قـورعـە " قـرعـە "** : بەش ، بەهرە ، نەسیب ، بەخت ،پا رچـــە یەک كا غەز یا ئێسک كەفا ڵی پێ دەگرنەوەوبەش وبەهرەی كەسێكـی پێ دیا ری دەكەن .

**قـەیـد " قـیـد "** : (١) بەند ، حەبس ، زیندا نی كردن(٢)ئـــەو پەتەی كەدەست وپێی ئینسا ن یا حەیوا نی پێ دەبەستن (٣)شـــــەرت وپەیما ن (٤) ئەودا غەی بەملی وشتریەوەدەنین ، (٥) بــــەش و ئەندا زە ، (٦) جۆرەئا ڵەتێكی دا ر ، ئەوئا ڵەتەیەكەسەححا فەكــــا ن دوای پەرا ویزلێ نا نی كتێب ، كتێبەكەی تێدا ڕا دەگرن .

**قـەریـب " قـریـب "** : نزیک ، نێزیک .

**قـەعـر " قـعـر "** : بن ، قوڵایی .

**قـا زی لاری** : نا وی موسلیحەدین لاری یە، خەڵكی نـــا وچـــەی لارستا نەوپەرا وێزی لەسەرزۆركتێبی عیلمی( دینی) هەیە .

ک =

**کامیل "کامل"**: تەواو ،بێ کەموکەسری ،خوورەوشتی تەواو .

**کاکۆڵ** : موی سەر ، دەستەموییکەلەسەرکەبەسەرنیێوچاوان دا شۆردەبێتەوە .

**کالا** : جل وبەرگ ، کەل وپەل ، کوتاڵی بازرگانی ، ماڵ و سامان .

**کەعبە "کعبە"**: کابە ، خانویەکی چوارگۆشەیەلەناوەراستی شاری مەککە ، بەردی رەش " حجرا لاسود " لەیەکێ لەسوچەکانی یەتی، لەسەردەمی جاهیلی دابوتخانەی بوتەگەورەکانی عەرەبە لات وعوززا ومەنات وهوببەل بو ، بیری زەمزەملەنزیکی یەوەیە ، حەزرەتی موحەممەد پەیامبەری ئیسلام بوتەکانی لەزا وبردوکردی بەقیبلەی موسوڵمانان،ماڵی خوداشی پێ دەڵێن، ئەم ناوەبۆسەردەمی جاهیلی وپاش ئیسلامیش دەشێ .

**کەلب " کلب "**: سەگ ، کەلبی موعەللەم: سەگی فێرکراو سەگی پەروەردەکراو ، سەگی دەرس دادراو .

**کەماڵ " کَماڵ "**: تەواوبو ، کامل بو ، بەکەموکوڕی، — خوورەوشتی تەواو ، عەقڵ ، ژیری .

**کەریمان** : جوامیران، گەورەکان ،

**کەس " کاس "**: پیاڵە ، جام ، کاسە ، پیاڵەیەک کەئاو یا شەرابی تێدا دەخۆنەوە . " کەسولکەرەم "کَأْسَ أَلْكَرَمْ" : کاسەیَ کەریمان ، پیاڵەی گەورەکان، جاموپیاڵەی ئەوکەسانەی گەورەو — خاوەن کەرەم وبەخشەندەن .

**کەلیم " کلیم "**: هاوقسە ، هاو سوحبەت ، "کەلیمولـلا = کیلم اللە" : نازناوی حەزرەتی موسایە ، کەلیمی: پەیرەوی —

حەزرەتی موسا ، یەهودی .

**کولبە** " كلبە ": کوخ ، خانوی هەژاران ، خانوی بچوک ، خانوی گوندوئاوایی.

**کینایەت" کنایە** ": وشەییکە لەجێی مانای راستی خۆی بەکارنا هێنرێ بەڵکوبۆمانا ومەبەستێ تربەکاردەهێنرێ .

**کونگرە** : کۆڕ، ئەنجومەن ، کۆڕێک کەلەنوێنەرانی چەند دەوڵەت بۆبەریوەبردنی کاروباری سیاسی وکۆمەڵایەتی پێک بێ، کۆڕی زانایان وشارەزایان وهونەرمەندان بۆباس ووتووێژکردنی مەبەستەکانی زانستی .

**کەشمەکەش**: کێشەکێش ، تێک هەڵچون ، بەیەکاچون ، گێرە وکێشە ، تەنگ وچەڵەمە ، بگرەوبەردە ، گفت وگۆوئاژاوە ، ـ دوژمنایەتی وناخۆشی .

**کوفار "کفار** ":کۆی کافر ، خوانەناس ، بێ ئیمان، بێ باوەر ، ناسوپاس .

**کیفایەت " کفایت** " : بەس کردن ، بەس بون ، کافی بون (٢) لێهاتویی .

**کەنعان** : ناوی جێگەوئەوعەشیرەتەیە کەیەعقوب سەرۆکیان بووە ، ناوی کونی فەلەستین ، یا ( ئەرزی مەوعود " "بەڵێنی پێدراو ".

**کەففی خەزیب " كفالخضيب** " : دەستی بەخەنەسورکراو ، بەری دەستی خوێناوی. (٢) چەندئەستێرەییکی بچوک وبەیەکەوە نوساون کەشێوە دەستێکی لەخنەدرا ونیشان دەدەن.

**کۆ** : کوچە ، کۆڵان، گەرەک ، رێی بارێکی ناوشاروئاوایی .

**کلیلە** : بەستراو .

گ =

**گوڵنار**: گوڵی هەنار، گوڵی سور، گوڵێ لەڕەنگی ئاگر.

**گولخەن** : ئاتەشخانە، ئاتەشخانەی گەرماو، تونی حەمام.

**گلاو**: پێس بون، پێس بون لەئەنجامی لەش بەلەشی سەگ یا بەرازبکەوێ .

**گریبان** : بەرۆک ، یەخە گەنج: خەزێنەی زێروزێووجەواهیرات وبەردی بەنرخی شاررا وەلەجێگەییکی نهێنی دا .

**گردین**: " هەورامی": هەمو، تێکڕایی .

**گوسەستە** : لێک هەڵوەشاو، لێک هەڵپێچراو، لێک جودا بووە

**گیج**: " هەورامی": گێژ، گێژاو.

ل =

**لالــــه :** (١) گولاڵەسورە ، گوڵێکی نیسا ن، گییا یکی بچوکـــه کەبە زۆری لەجێگەی تەرونا وشا خ وقەرا خ ئا ودەڕوێ،کێوی وما ڵـی هەیە ، هەروەها لەڕوی ڕەنگ وژما رەی پەریەوەجۆری زۆرە ،کیــــوی یەکەی ڕەنگی سورەلەژێرپەرەکا نی دا لەککەییکی ڕەش هەیە (٢)جۆرە چرا دا نێکی بەللوری یەموّمی لەنا ودا دەنرێ، لالەروخا ن؛ لالەڕووا ن لالەڕوخسا را ن .

**لائیــق** " **لائــق** ": شا یا ن ، لێ وەشا وەوە .

**لاف وگـەزا ف** :خۆهەڵکێشا ن، قسەکردنی بێ ما نا ، دا وا کردنی زیا دلەرا ستی .

**لــەعلــی بــەدەخشــا ن** : یەکێکەلە بەردەبەنرخەکا ن ورەنگــی سورەوەکویا قوت ، چەشنەئۆکسیدێکی ئا لۆمینی ڕەنگا ورەنگــەلــە تەبیعەت پەیدا دەبێ ، جوا نترینی لەعلی بەدەخشا نە ، لەعلـــــی بەدەخشا ن : کینا یەتەبۆلیّوی سور ، دەمی یا ر ، شەرا بی سور ،مەیــی ڕەنگ سـور .

**لــەفـف ونــەشـر** " **لــف ونشــر** ": (١) پێچا نەوەوبلاّوکردنەوە (٢) لەزا را وەی زا نستی " ئەدەب " دا ئەوەیەکەشا عیرچەندوشەییک یا چەندنا وێک لەدیرەشیعریک دا بهێنێ، وەلەدیرەشیعری دا ها تــودا سیفەت بۆئەووشا نەبهێنێ،.بەو وا ژەو نا وا نەدەڵێن" لەفف"وەبــە سیفەت بەرا وردەکا نیشی دەڵێن"نەشر" لەفف ونەشرسێ جۆرە ،(٢) ـ لەفف ونەشری مورەتتەب : وا تە وا ژەی یەکەمی نەشرپێوەندی بــە وا ژەی یەکەمی لەففەوەدەبێ، وە دووەم بەدووەم وسێیەمبەسێیەم ، تا دوا یی(٢) لەفف ونەشری مەعکوس : وا تەوشەی یەکەمی نەشــــــر پێوەندی بەوا ژەی دوا یی لەففەوە دەبێ(٣) لەفف ونەشری موشە و وەش ئەوەیەکەتەرتیب ودە ستوری تا یبەتی ودیا ری کرا وی نیە .

لەیلا" لیلی ": کچی مەهدی عامیری یە ، ناوی ژنێکی عەرەب بووە . بەلاّم باوکی ویستویەتی بیدا بەکا برایەک ناوی ئیبن سەلام بووە، بەلاّم لەیلاشوی پێ نەکردووە ولەدا خی دلّدا ریمەجنون مردووە لەپاش ئەومەجنونیش کۆچی دایی کردووە نیزامی گەنجەوی شاعیری بلّندپایەلەچیرۆکی شیعری" لەیلێ ومەجنون" ئەرِودا وانەی کردووە بەئەدەب وهونەرێکی یەکجا ربەرزونایاب .

**لەیل ونەهار** "**لیل ونها ر**": شەو ورۆژ .

**لەتیف** " **لطیف** ": نەرم، ناسک ، جوان ، دلّسۆز ،میهرەبان ، خوورەوشتی چاک .

**لیقا** " **لقا** ": (١) دیدارکردن، دیتن ، دیتن وقسەکردن لەگەلّ کەسێک ،(٢) رِو، روخسار .

**لەولا** "**لولا**": وشەییکەتێکەلاّو لەلەوولا= لوولا": واتە ئەگەرنا ،" لەولاک . لولاک ": واتەئەگەرتۆنەبای، ئیشارە بە حەدیسی بەناوبانگی : " لولاک لما خلقت الافلاک ": کەرِوی قسەی لەگەلّ پێغەمبەری ئیسلامە ، واتەئەگەرتۆنەبای ئاسمانەکانم دروست نەدەکرد .

**لوئالی** " **لئالی**": کۆی " لوئلوء = لوءلو": دورِ، مرواری .

**لەهجە** " **لهجە**": زبان، زبان ووشەیەک کەئینسان قسەی پێ دەکا ، شێوەی قسەکردن.

م =

**ماهی تابان** : مانگی تریفەدار ، مانگی درەوشەدار ، مانگی روناک .

**ماتەم"ماتم"**: پرسە ، تازیە .

**ماشی فورات " ماء فرات "**: ئاوی ڕوباری "فورات ".

**مایل " مائل "**: ئەوەی ئارەزوی شتێک دەکا ،ئەوەی بە شوێن شتێک دا دەگەڕێ، لایەنگر .

**مەجبور " مجبور"**: ناچار ، بێچارە ، ئەوکەسەی کاری بە دەست خۆی نەبێ، ئەو کەسەی بەزۆرکا رێکی پێ بکرێ.

**مەئوا " ماوا = ماوی "** : جێگە ، پەناگا ،ماڵ، هێلانە .

**مەتاع" متاع"**: کالا، سامان، هەموشتێکی سودی هەبێ ، زێروزیو .

**مەئیوس " مایوس "**: ناهومێد ، بێ هیوا ، بێ ئامانج، دڵ سارد ، دەست شوشتن لەشتێک .

**مەحروم" محروم"**: ناهومێد ، بێ بەش ،بێ بەهرە ،دورلە هەمو خێروخۆشی یێک .

**مەحرەم" محرم"**: کەس وکاری نزیک ، ئەندامانی بنەماڵە ، ئەوانەی نابێ شوکردن لەنێوانیان دابێ .

**موحەررەم" محرم"**: مانگی یەکەملەساڵی کوچی مانگی، " شهرالحرام ومحرم الحرام " یشی پێ دەڵێن، ئەومانگەبۆیە پێی دەڵێن موحەررەمچون عەرەبەکان شەڕکردنیان لەومانگەدا بەحەرام زانیوە .

**مەسلەک "مسلک "** : ڕێ، ڕێباز ، ڕێگە ، رەوشت ،تەریقەت

**مەشکور"مشکور"** : ئەو کەسەی سپاس دەکرێ، ئەوکەسەی

كا روكردەوەی ئەسنددەكرێ، سوپا س وتن .

**مەسرور " مسرور "**: شا دما ن ، شا د ، خۆشحا ڵ ، دڵخۆش .

**موبەررا " مبری "**: ئەوكەسەی لەتا وا ن پا ك وبەدورە ،ئەو كەسەیەكەلەدوا یی دا ئا شكرا دەبێ كەتا وا نی نەكردووە .

**مەرجا ن** : بەردێكی سوری مەیلە وپەمەیی بەنرخەلەجۆرە جا نەوەرێكی دەریا یی دەردەهێنرێ، ئەو جا نەوەرەلەگیا دەكا ،هەر وەكوئەویش لەزەوی بن دەریا چەسپا وە ، لەكۆن دا وا یا ن دەزا نی كەیەكێكەلەگیا كا نی دەریا ،جۆرێكی مەرجا ن لەزەرنگەی دا بەكا ر دەهێنرێ بۆدروست كردنی خشڵ وشتی تری هونەری بەنرخ.

**مەجنون "مجنون"**: (١)قەیسی عا میری، خەڵكی نەجدبووە ،لەرا ستی دا شێت نەبووە ، بەڵكوپلەی دڵدا ریوخۆشەویستی بەرا مبەر لەیلا وا ی لێكردووە ، لەگەڵ لەیلادا ئا مۆزا بون، بەلآم كەویستی لەیلابخوا زێ با وكی نەیدا یە ، سەری خۆی هەڵگرت وروویی بۆبیا با نە كا نی شا م ونەجدوحیجا زوكەوتەشیعروتن، لەگەڵ كێوی یا دانەدەبیژرا تا رۆژێك بەمردویی لەنا وكۆمەڵەبەردێك دۆزرا یەوە ، ئەسمەعی دەڵێ مەجنون نەبووە ، چا حیزیش دەڵێ هەرشا عیرێكی نەنا سرا و شیعریكی وتبێ ونا وی لەیلای تێدا بوبێ،خرا وەتەپا ڵ مەجنون،گۆیا لەسا ڵی ٦٨٨ زا یینی دا مردووە ،(٢) شێت ، سەرچڵ ، دیوانە .

**موجەررەد "مجرد "**: (١)روت ، بێ جل وبەرگ ، تا ك وتەنیا پیا وی بێ ژن (٢) لەزا را وەی زا نستی حیكمەت دا ئەویەكەدوربێ لە ماددە وەكو بیروگیا ن .

**موتلەق " مطلق "**: (١) ئا زا د، رزگا ر (٢) ئەڵبەت ، دیا رە، دەبێ، بەهەموجۆرێ .

**موتریب " مطرب "**: گۆرا نی بێژ، موسیقا ژەن،سەما كەر .

**میهر "مهر "** : (١) دڵسۆزی، خۆشەویستی، دۆستی، (٢) رۆژ ،-

خوڕ ، هەتاو ، (٣) لەپێش زەردەشتدا ناوی یەکێک لەخوداکان بووە کەلەڕۆژدا خۆی نوواندووە ، (٤) مانگی حەوتەمی ساڵی هیجری خورشیدی ئێرانی یە ، مانگی یەکەمی پاییزە ، (٥) ناوی ڕۆژی شازدەهەمی هەموو مانگێکی خورشیدی یە (٦) جەژنێکەلەکۆن دا لە ڕۆژی شازدەهەمی مانگی میهربووە ، میهرەگانیان پێ وتووە ، (٧) ناوی کچە .

**موبارک " مبارک "** : پیرۆز ، بەپیت وبەرەکەت .

**موسحەف " مسحف "** : قورئان ئەوکتێبەپیرۆزەئاسمانیەی کەبۆحەزرەتی موحەممەدبەدیاری هات .

**مەجزوب " مجذوب "** : ڕاکێشراو ، ئەوکەسەی سەوداسەر و شەیدای عیشق بووە .

**ماعاریف "معارف "** : (١) زانستی، زانستی یەکان،زانیاری (٢) خەڵکی ناسراو ، زاناوشارەزا ، نزیک وناسیاوتی .

**مەرحەمەت " مرحمت "** : میهرەبانی، بەزەیی پێداهاتن لوتف ورەحمەت .

**مەحەببەت " محبت "** : خۆشەویستی ، دۆستی .

**مەشعەلە " مشعل = مشعلە "** : ئاگری تێدا دەکرێتەوە . چرادان، قەندیل ، شاپلێتە .

**مەشرەب " مشرب "** : (١) زەوق ، مەیل ، خەیاڵ، هەوای نەفس ، شێوەی بیرکردنەوە ، (٢) جێی ئاوخواردنەوە .

**مەجمەعە " مجمعە "** : زەمینێک کەخەڵک لەوێ داکۆببنەوە ، بیابانی بێ ئاووگیا ، مەجومعە ، سینی گەورە .

**مەجموع "مجموع"** : کۆکراوە ، دەفتەرێک کەمەبەستی جۆرا و جۆری تێدا کۆکرابێتەوە ، وەکوشیعرو نوسراوەی تر .

**مەجمەر " مجمر "** : بخوردان، (٢) ئاگردان، ئەوشتەی ئاگری تێدا دەکرێتەوە .

**موشتاق " مشتاق"**: ئارەزو، ئارەزومەند، تاسەخواز، ـ ئەوەی مەیل وئارزوی شتێک دەکا، خاوەن شەوق وئارەزو.

**موشتەق " مشتق "**: جیابونەوە، شتێک لەشتێکی تر جودا بوبێتەوە، وشەیەک لەوشەییکی تروەرگیرابێ ودروست کرابێ.

**موشەووەش " مشوش "**: شێواو، پەشێو، پەرێشان، تاریک.

**مەسئەلەت " مسئله . مساله "**: داواکردن، ویستن، تکا کردن،.

**مەتلەع " مطلع "**: (١) پێشەکی، سەرەتای قسە، یەکەمین دێری غەزەل یا قەسیدە (٢) ئەو جێ ولایەی کەرۆژومانگ وئەستێرە ـ کانی لە هەڵدێ.

**مونتەخەب " منتخب "**: تایبەتی هەڵبژێررا و، نوێشک.

**مەعریفەت " معرفت "**: ناسینی شتێک، زانستەزانیاری (مەعریفەتوللا = معرفت الله": خواناسی.

**مەعشوق "معشوق"**: یار، خۆشەویست، دڵبەر.

**مەعدوم" معدوم"**: لەناوچو، تیاچو، نەبون، نەبو.

**مەنزور" منظور"**: ئەوەی دەکەوێتە بەرچاو، دیار، بێزاو، ئەوەی دەبیزێ.

**مونتەزیر " منتظر"**: چاوەنور، چاوەروان، چاوەروانی.

**مەنزل " منزل"**: خانو، شوێنی دابەزین، شوێنی.

**میعراج" معراج"**: پەیژە، قالدرمە، پێپلکانە، ئەوشتەیە کە بەهۆی ئەوە وەئادەمیزادەتوانێ بەرزببێتەوە، شەوی میعراج: ئەوشەوەیە کەحەزرەتی موحەممەد بەفەرمانی خودا بەرزبووە بۆ لای یا رەگای خودا وگەیشتە مەقامی ئەو، ئەوجییەی کەس نەیگەیشتوتێ.

**مەدینە " المدينة"**: (١) شارێکە لەحیجازلەباکوری رۆژ ئاوای ولاتی عەرەبی سوعودی، لەخاکێکی پڕلەئاوومیوەدایە، لە

پێشا ناوی " یەسریب .یثرب " بو ، حەزرەتی موحەممەدپێغەمبەری ئیسلام لە ٦٢٢ ی زایینی هیجرەتی کردە ئەوێ و لە ٦٣٢ زایینی حەزرەتی رەسول ( د ـ خ ) لەمەدینە وەفاتی کرد و دوای ئەو زاتە ،حەزرەتی ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان بەدوای یەکدا بونە خەلیفەوجێ نشینی پێغەمبەر ، مەقدی پێغەمبەر و سێ کەس لەخولەفای راشیدین: ئەبو ـ بەکر و عومەرو عوسمان ( رض) لەمەزارو مزگەوتی نەبی ئەکرەم لـە مەدینەیە ، لە ساڵی ٥١٧ زایینی مەدینە کەوتە بن دەس تـورکی عوسمانی ولە ساڵی ١٩١٦ زایینی لەدەست عوسمانی یەکان دەرچـو و لە ١٩٢٤ ی زایینی کەوتە بن دەستی عەرەبی سعودی .

**مەنتیق " منطق "**: (١) قسەکردن، وتار، تەرازوی قسـە (٢) ناوی زانستی یێکەبەهۆی دەستوری ئەوەوە ئادەمیزاددەتوانێ خۆی لەهەڵەبپارێزێ لەبیرکردنەوە یا لێکدانەوەدا ، دەڵێـن ئەرەستودەستوری ئەم زانستی یەی دۆزیوەتەوە .

**مەدار "مدار"**: جێی سورانەوەو بزوتنەوە، ئەوشتەیەکـە شتێک لە چواردەوری دادەسوڕێتەوە، ئەوجێیەیەکەشتێک دەورەی ـ دەدا ، لەزاراوەی جوغرافیادا بریتی یەلە وخەتەی کە ئەستێـرە گەورەکەکان تێیدا بەدەوری رۆژدا دەسوڕێنەوە، دائیرەییکی نـا ـ دیارەلەسەرزوی زەوی، موازی خەتی ئیستیوایە .

**مەستور " مستور"**: (١) داپۆشراو، لەپشت پەردە (٢)دا ویـن پاک،بەناموس ، بەحەیا (٣) ئەندامی مێینەی ژن .

**مەسموم " مسموم"**: ژەهر خواردو، کەسێک کەژەهربچێتەناو لەشیەوە .

**مەبحەس " مبحث "**: باس جێی لێکۆڵینەوەوگەڕان بەدوای شتێک دا .

**میسال "مثال"**: کۆی " مەسەل = مثل"ە: وەکو، سیفـەت ،

قسەی نەستەق ، قسەی داهێنراو .

**موعەتتەر"معطر"**: عەتراوی، بۆنخۆش .

**مرید** : خاوەن ئیرادە ، ئەوەی بڕیاردەدا لەسەرکردنی شتێک ، ئەوەی ئارەزوی شتێک دەکا ، ئەوکەسەی ببێ بەپەیرەوی پیرێک وشێوەورەوشتی تەریقەتی لیفێرببێ، مورشید ، لەزاراوەی ـ سوفیایەتی دا بۆلایەنگری تەریقەتی دەرویشی بەکاردەهێنرێ (٢) یەکێک لەسیفەتەکانی سبوتی خوای گەورەیە .

**مەلەکوت " ملکوت "**: گەورەیی، هێزودەسەڵاتی ئاسمانی، دونیای فریشتەکان، مەلەکوتی: نیسبەتە بۆمەلەکوتە واتەئاسمانی مەلاییکەیی .

**مەلول"ملول"**: پەشێو ، خەمگین، شێواو ، دڵتەنگ .

**ملکی وەحدەت ( ملکی وحدت "**: مُڵکی خواناسی، مُڵکی ـ یەکتاپەرستی .

**مەرارەت " مرارت "**: تاڵ بون، تاڵی، ڕەنج وسەختی، ناخۆشی .

**مەزاق "مذاق "**: تام، چێژ ، چەشتن ، زەوق ، جێگەی هێزی چەشتن ، ژێرزبان .

**مورشید " مرشد "**: ڕێنما ، ڕێبەر ، ئەوکەسەی ڕێی ڕاست بەخەڵک نیشان دەدا .

**مەکتەب " مکتب "**: جێی نوسین ، جێی دەرس وتنەوە ، فێرگە ، مەدرەسە .

**مینا** : شیشە ، بەللور ، ئاوێنە ، نەینوک (٢) هەموشتێکی بەڵاجیوەر دوزێروزیو وبەردی بەنرخ نەخش کرابێ(٣) جۆرەرەنگێکە بۆکاردەهێنرێ، (٤) میناتور ، وێنەکێشان، نەخش کردن بەلاجیوەرد وزێروزێوئاووڕەنگ لەسەرروی کاغەز یا مەعدەن(٥)پێستی سپی سەردان (٦) ناوی بالندەییکە ، (٧) گوڵێکی جوانەناوەراستی

خـرو زەردەپەری سپی یا شینی کالی بوتەوە (٧) جێ ییکەلەشاری مەککە ورەببانی لێ دەکرێ، ئەو ئەوقوربانییەی لەوێ دەکـــرێ، " نەحری مینا " ی پێ دەڵێن .

مـەهیـب " مهیـب ": سامناک ، بەهەیبەت ، کەسێک یا شتێک کەئادەمیزا دلێی بترسێ .

مـەهلـەکـە " مهلکـە ": جیێ لەنا وچون، جیێی قەڵاچو بون، ـ مەیدانی جەنگ کەخەڵکی تێدادەکوژرێ .

مـەنشـە، " منشـاء ": سەرچاوە، شوێینی پەیدابون،شـوێینـــی دیاربون، جێگەی نەشوونما وپەروەردەبون.

مـرووەت " مـروت ": پیاوەتی جوامێری، جەوانمەردی،مەر ـ دانەیی، دڵ ناسکی .

مـەنسـور " منصـور ": یارمەتی دراو، یاریدەدراو، ســـەر ـ کەوتـــو .

مـوخلیـس " مخلـص ": دۆستی پاک ، دۆستی بێ ریا وبێ خەوش ئەوکەسەی کاری بێ ریا دەگەیەنێتە ئەنجام .

مـەحشـور "محشـور": هاورێ، هاودەم، هاونشین، هاوسوحبەت لەدەوری یەک کووبو .

مـەحـز "محـض ": خالیس ، پاک ، هەرشتێکی خالیس کەلـەگەڵ شتێکی ترتێکەڵاونەکرابێ .

مـوحـەسسیـل " محصـل ": بەدەست هێنەر ، ئەوکەسەی شتێـــک بەدەس بێنێ، تەحسیل دار ، مەئموری وەسول، قوتابی، شاگـــردی مەدرســە .

مـەسحـور "مسحـور ": سیحرلی کراو، جادولێکراو، فریودراو .

میـزاج: تێکەڵ بون تێکەلاو بون ، ئەوەی کەشتێکی لەگەڵ تێکەڵ بوبێ، وەکو شیریا شەراب لەگەڵ ئاو (٢) سرشت ، خووڕەوشت تەبیعەت ، حاڵەتی سروشتی بەدەن .

**موڵاقات " ملاقات"**: لەگەڵ کەسێک ڕوبەڕوبون، ڕوبەرو- بون لەگەڵ یەکتر، یەکتردیتن .

**مونافات " منافات "**: یەکتردەرکردن، یەکتردور - خستنەوە، پێچەوانەی یەکتربون.

**موحیببان " محبان"**: دۆستان ، خۆشەویستان .

**موشتەری " مشتری"**: (١) کریار، ئەوکەسە کەشتێک دەکرێ. (٢) ئەستێرەی گەرۆکی بەرجیس ، ئەستێرەی هورمز ،گەورە ترینی ئەستێرە گەرۆکەکانی بنەماڵەی رۆژە ، لەڕوی رواکێشەوە- لەدوای زوهرە. دوهەمین ئەستێرەیەنزیک بە ١٢٣٠ بەرامبەری زەوی یە ودوازدەمانگی هەیە وهەردوازدەساڵ یەک دەوربەدەوری خۆردا - دەگەرێ ، قازی فەلەکیشی پێ دەڵێن .

**موشک** : ماددەییکی بون خۆشە لەناووکی مامزی موشک دێتە دەرێ، مامزی موشک جۆرە ئاسکێکەدوکەڵبی درێژی هەیە وەکونابی فیل، زۆرترلەشاخەکانی هێمالیای هێندوستان دەژی، لەژێرزکـــی کیسەییکی بچوکیوەکو دومەڵ هەیە ماددەییکی پەیتی تێدا کـــۆ- دەبێتەوە هەر کاتێکی کەکیسەکی پڕدەبێ مامزکەهەست بە ئازار و خارشت دەکا ، ناچارلەبەردی دەخشێنێ تادومەلەکەدەتەقێ وئـــاوی پۆرگەکەدەرژێتە سەروی زەوی ووشک دەبێتەوە، ئەمەماددەیموشکی بون خۆشە ، مامزی تاتاروما مزی خەتاومامزی موشکینیشی پـــێ - دەڵێـن .

**موفلیس " مفلس "**: هەژار، بێچارە، بێ شت ، بێ ماڵ و سامان ، بێ پوڵ ، دەستکورت .

**مودارا " مدارات = مدارا "**: رەفتارکردن لەگەڵ کەسێک بەروخۆشی ومیهرەبانی ، ڕوی خۆش نیشان دان بەکەسێک .

**موهر " مهر"** : (١) مور ، ئالەتێکی مەعدەنی یا پلاستیکییە ناوی کەسی لەسەرهەڵدەکەندرێ، لەباتی ئیمزالەنامەوپـــا کـــەت

وشتي تردا چاپ دەكرێ، یا شتێک دادەخرێ بۆئەوەی نەكرێتەوە مۆری لێ دەدرێ، (٢) كیسەی سەربەسترا و ، كیسە ناكراوە .

**مونافی" منافی"**: پێچەوانە ، پێچەوانەی یەكتربوون، یەكتردەركردن ویەكتردور خستنەوە .

**موحاباه " محاباه"**: لایەن گرتن، یا ریدەدان،لایەن گرتنی كەسێک بەبێ هەق .

**موددەعی "مدعی"**: ئەوكەسیە كەداوای لای یەكێكی تر هەیە ، ئەوكەسەی داوای هەقی خۆی دەكا .

**موئمین " مؤمن"**: بەئیمان ،موسوڵمان، پێچەوانەی — كافر .

**مەئمول " مامول "**: ئارەزوكراو ، ئاواتەخواز ،تاسەبار.

**موجاز "مجاز"**: ئیجازەدراو ، خاوەن ئیجازە ،ئیزن دراو ، رەوا .

**موددەعا "مدعا "**: بانگ كراو ، داواكراو ،ئارەزو .

**موعتاد " معتاد "**: خۆگرتو ، ئەوكەسەی بەكارێک یا بە شتێک خوبگرێ .

**مولا "مولا"**: خاوەن ، گەورە ، سەروەر ، ئاغا ، خۆشەویست.

**مەوزون " موزون"**: كێشراو ، ئەوەی قورسایی هەیە ، ئەوەی قاڵب وئەندازەی خۆی گرتووە .

**مول " مل"**: شەراب ، مەی

**مونیس " مونس "**: هاودەم، هاونشین، خوپێ گرتو .

**مونكیر " منكر "**: بێ باوەر ، ئەوكەسەی باوەری بەكارێک یا شتێک نەبێ .

**میقدار " مقدار "**: ئەندازە ، پارچەیەک لەشتێک، ئەوەی بەهۆی ئەو ئەندازەی شتێک بەدەدست بێ .

**مەنسور "منشور"**: پرژاو، پەرت وبڵاو، پراکەندە، (٢)ـ پەخشان ، نەسر.

**مەهوەش** : جوان ، دڵبەر، مانگ روخسار، مەهوەشان، ئەو کەسانەی روخساریان وەکومانگ جوانە، رویان دەڵێی مانگە.

**موددەببیر " مدبر "**: راوێژکەر، ئەوکەسەی بیری پاشە رۆژی هەیە، ئەوەی پاشەرۆژی لەبارچاوە.

**مونحەسیر " منحصر "**: راوەستاو لەسەرشتێک .

**مەفقود "مفقود"** : گومبو، ون بو.

**مەبدەء " مبدا "** : سەرەتا ، بنەرەت ، ئەسڵ ، هۆ.

**مەتبوع " متبوع"** : پەیرەوی کراو.

**مەحفوز " محفوظ"**: پارێزراو، راگیراو.

**موعین " معین"**: یاریدەدەر، یارمەتی دەر، یاوەر،یار.

**مەنع "منع"** : راگرتن ، وەستاندن، وەستاندنی کەسێک لە کارێک یا شتێک .

**مەنزڵ** : خانو، جێگەی دانیشتن وژیان، سەرا .

**مەزلوم " مظلوم"** : ستەم لێکراو، ستەمدیتو، ئەوکەسەی زوڵم وستەمی لێ کرابێ .

**مەعاسی " معاصي"** : کۆی"مەعسیەت = معصیت " : گوناه، تاوان .

**مومتاز** : هەڵبژێردراو، تایبەتی ، جوداکراوە.

**مەجاز " مجاز "**: وشەیەک لەجێی راستەقینەی خۆی بەکار نەهێنرێ وبۆمانایکی تروەربگیرێ بەمەرجێک پێوەندی یەک بە مانابنچینەیی یەکەبیان بەستێتەوە .

**موشکیل " مشکل = مشکلە "**: کاری سەخت ، کاری قورس، ئاڵۆز ودا پۆشراو.

**مـوژگـا ن** :مژوڵ ، بژا نگ ، برژا نگ .

**میـرئـا ت " مـرآه "**: ئا وێنه ، نەیئوک .

**مـوهـەییـا " مهیـا "**: ئا ما ده، حا زر، ×

**مـەئسـور"مـا ثـور"**: قسەوبا س، قسه وبا سێک کەلەکۆنەوەلـە یەکێکەوه بەیەکێکی تر گەیشتبێ .

**مـەلاحـەت " مـلاحـت "**: دڵبەری، جوا نی ، پڕخۆی بون.

**مـەزبـەلـە " مـزبلـه "**: زبڵخا نه ، جێی رشتنی زبـڵ .

**میحنـەت " محنـت "**: ئا زا ر ، بەلا، خەم، خەفەت ، کا رەسا تە کـەسـەر .

**میـرا ن** : (١) ئەرا زو، ئەندا زه، (٢) نا وی بورجی حەوتەمه.

**مـەعمـور " معمـور "**: ئا وا ، ئا وەدا ن ، تەعمیرکرا و، دژی کا ول وکەلاوه،.

**مـەخـزەن "مخـزن"**: گەنجینه، عەمما ر، جێی پا را ستنیما ڵ .

فێڵبا ز، پڕمەکر، جا دوگەر.

**مـەسـدود " مسـدود "**: بەسته، بەسترا و، دا خرا و.

**مـەیـت " میـت "**: مردو.

**مـەسـرەف " مصـرف "**: خەرج کردن.

**مـوئـەددیب " مـودب "**: خا وەن تەربیەت ، بەئەدەب .

**مـەجهـول " مجهـول"**: شەرمەزا ر ، خەجا لەتی پیما و.

**مـەزبـوت " مضبـوط"**: وەرگیرا و.

**مـەکتـەبـی روشـدی یـه** : ئیبنی روشدئەبولوەلید "٥٠٢–٥٩٥ی" کۆچی ما نگی فەیلەسوفیەنا وبا نگی عەرەب کەدا نیشتوی ئیسپا نیـا بووه وخەڵکی " قەرتەبە " یە، نزیک بەپەنجا جلدکتێبی نوسیوەکـە یەکێک لەوکتێبا نەفەلسەفەی ئیبنی روشده، ئەلکوللیا تی ئەولـە

زانستی پزشکی دا بەزمانەکانی لاتین وئیسپانیایی وعیبری تەرجەمەکراوە، لەولاتی مەراکیش کۆچی دوایی کردووەولە شاری " قەرتەبە " بەخاک سپێردراوە.

ن =

**نـار**: ئاگـــر

**نـافـه**: وەکوناوک ، ناوک ئاسا . وێنەی ناف ، ناوکیماسزی موشک ، ئەوماددەیەی کەلەناوکی ماسزی موشک دا کودەبێتەوە .

**ناتیـق " نـاطـق"**: رەوانبێژ، قسەزان ، چاوێژ، قسەرەوان دەمەوەر، فەسیح.

**ناقیـس " ناقـص "**: هەرشتێک کەکەوکەسری تێدابێ .

**نـاگـەهـان**: لەناکاو، لەپڕدا ، سەرزەدە، بێ خـــەبــەر، بێ وەخت .

**نـایـب " نـائـب "**: جێ نشین جێگر، کەسێکەلەبا تیەکێکی تر کاروبارەدەگەیەنێتەئەنجام .

**نـەبـاتـات " نـبـاتـات "**: کۆی نەبات = نبات : گیا ، ــ هەموشتێکی کەلەسەرزەوی بڕۆێ، وەکوگوڵ وگیا ودارو درەخت .

**نـەزم" نظـم"**: (١) شیعر، قسەی کێش وقافیەدار، دژی ــ پەخشان (٢) ڕێک وپێک کردن ، جوان کردن، بەرستەوەکردنی مرواری

**نـەزارەت "نظـارت "**: بینین ، ڕوانین، چاوەڕوانی، چاوەدێری، چاولەڕێ بون (٢) زیرەکی وریایی .

**نـەشـر" نشـر"**: (١) بلاوکردنەوە، بلاوکردنەوەی دەنگ وباس (٢) هەلخستنی جل وبەرگ وپارچەی شۆراو، (٣) زیندوکردنەوە، ــ زیندوکردنەوەی مردومان لە ڕۆژی قیامەت دا ، دژی لەفف زاراوەیەکە لەشیعردا بەکاردەهێنرێ ، بڕوانە " لەفف ونەشر".

**نـەسـر " نثـر"**: پەخشان، پەرگەندەکردن، قسەو وتـەیـــــک شیعرنەبێ .

**نـەفـس " نفـس "**: گیان، لەش ، جەوهەری هەموشتێک ،نەفسی ئەممارە: گیانی شەتیانی کەئادەمیزادفریودەدا وهەلی دەخەلـــە تێنێ بۆکاری خراپ وناپەسەند .

**نەفەس "نفس"**: با ، هەناسە ، ئەوبایەیەکە لەکاتــی هەناسەکێشان دا لەنێوان سی ودەمدا دێ ودەچێ .

**نیسبەت " نسبت "**: نزیکایەتی ، پێوەندی لەنێوان دوشت یا دوکەس ، لەیەک چون لەنێوان دوشت .

**نیسار " نثار "**: پەراگەندەیی، پەرش وبلاوی(٢) ئەوشتانەیە کەبەسەربوک یا هەرکەسێکی تردا دەکرێ لەسەردەمی خۆشی وبەختیاری دا ، لەشیرینی و پارەوشتی تر .

**نەسیم**: سروە، شنەی بای شەمال ، شنەی با .

**نەزیر "نظیر"**: وەک یەک ، بەرامبەر، هاوتا ، وێنــەی یەک .

**نیزام " نظام "**: رێک وپێک کردن ، ئاراستەکردن، رستــە کردنی مرواری، رستەی مرواری، شێوەورەوشت ، ریزی دارو درەخت لەفارسی دا بەمانای سپا وئەرتەش .

**نیزاع " نزاع "**: شەروکێشە ، گفت وگۆوکەشمەکەش ، جەنگ .

**نەقش "نقش "**: رەنگ رِشتن، کێشانی وێنەوروخساری کەسێک یا شتێک .

**نوقسان " نقصان"**: کەمێ ، کەم بون.

**نەقد " نقد "** : هەڵاوەژێری ، پاک کردنەوە، جوداکردنەوەی پارەی ساغ لەقەڵب ، دەرخستنی جوانی وناشیرینی قسە ووتارو — شیعر (٢) پارە، پوڵ ، نرخ ، نەقدی عەیار .

**نوقتە " نقطە "**: نیشانەییکی بچوک وخرە لەژێریا لەسەر هەندێ پیتی نوسین داهەیە ، وەکونوقتەی سەرپیتی(ن) یا ژێرپیتی (ب) خاڵ .

**نەمام**: گیاودارى تازەپێگەیشیو ، هەموکەس وشتێکی تازە پێگەیشتو .

**نیش** : (١) نوکی تیژ ، وەکودەرزی وخەنجەرونەشتەروهی تر (٢) چزوی هەندێ زیندەوەری وەکودوپشک وزەردەواڵەو مارکە زەهریان بەهۆی ئەووەدەرژێننەنا ولەشی ئادەمیزاد .

**نەقایس" نقائص "**: کۆی" نەقیسە= نقیصە": بڕوانە نوقسان " نقصان".

**نیسیان " نسیان "**: فەراموش کردن، فەرامۆشی، لەبیر چونەوە ، لەیادچونەوە .

**نوعمان " نعمان"**: نازناوی هەریەک لەفەرمانرەوایان وپادشایانی حەیرە ، (٢) بەمانای خوێن، "شقائق النعمان": گوڵ لالە ، گوڵاڵەسورە .

**نمەدپوش** : ئەوکەسەی جل وبەرگیپێنەوپەروی دەروێشی دەپۆشێ .

**نیگار** : (١) بوت ، خۆشەویست ، مەعشوق ، دڵبەر ،مەحبوب (٢) نەقش ، وێنە .

**نیگاە** : روانین ، تەماشاکردن ، چاو ، رونی کردن .

**نەوا** : (١) ئاهەنگ ، ئاواز ، (٢) ناوی ئاوازێکی تایبەتی یە (٣) ماڵ وسامان، هۆی زیندەگانی (۴) خواردەمەنی .

**نەدامەت " ندامت "**: پەشیمانی، دڵگیری،خەموخەفەت .

**نەحو "نحو"** : (١) زانستی ییکەلەبابەت ئیعراب ودەستوری راستخوێندن ودروستنوسینی زمانی عەرەبی یەوەیە ، (٢) وەکولا، رێگە .

**نەفیی" نفی "** : دورخستنەوە ، نەبوکردن(٢) دەرکردن دورخستنەوەی کەسێک لەشارێکەوە بۆشارێکی تر ، ئاوارەکردن.

**نیدا " ندا "**: بانگ کردن ، بانگ وئاواز .

**نەقیزەین " نقیضین "**: پێچەوانە ، دژ وپێچەوانەی دو شت ، سەرەوژێری .

**نمانا " هەورامی"**: نواندی، دەری خست ، نیشانی دا .

**نەشوجەوبرت " هەورامی"**: لەیادت نەچێ، لەبیرت نەچێ، فەرامۆشی نەکەی .

**نیهایەت " نهایت "**: دوایی، پایان ، ئاخر،دوایی کارێک یا شتێک .

**نەوخیز**: تازە رووا و ، تازەدەرهاتو ، تازەپێ گەیشتو .

و =

**واریس " وارث "** : میراتگر، ئەوەی میراتدەبا، ئەو کەسەی میراتی بۆ دەمێنێتەوە لەیەکێکی ترەوە.

**والا** : بالابڵند، بەرز، پایە بڵند، (٢) جۆرەقوماشێکی ئاوریشمی یە.

**واسیع " واسع "**: فراوان، بەرین، دژی تەنگ.

**وەسف " وصف "**: پێدا هەڵکوتن، دەرختنی شێوەی شتێک یا کەسێک دەرختنی وەزعی شت.

**وەسوەسە**: ئەندێشەی بەد پەیداکردن، بزوتنەوەی هەوا و - هەوەسی شەیتانی لەناودڵ دا =

**وەسل " وصل "**: پێوەند کردن، بەستن بەیەکتری یەوە، بەیەکتری گەیشتن.

**وەنەوشە**: گیایەکی کورتە، قەدی باریک وگوڵی بچوکیهەیە، رەنگی شین یا زەردەبێ، لەباخچەدا دەروێنرێ،لەتەبیعەتیش دا بەهاران لەپێش هەموگوڵێک دادەردەچێ، بۆنی خۆشەو گوڵاوی لێ دەردەهێنرێ.

**وڕێنە**: هەزەیان، بێهودەوتن، لەحاڵی نەخۆشی یا لە خەودا، قسەبرزکاندن، وتاری بێهودەو ناعاقڵانەلەحاڵینەخۆشی دا.

**وەعز " وعظ "**: پەندوئامۆژگاری دان، ئامۆژگاری کردن، ئاراستەکردن بۆکاری چاک.

**وەعدە**: (١) پەیمان، بەڵێن، (٢) سەردەم، کات.

**وەعید " وعید "**: بەڵێنیدانی شەڕوبەدی، وەعدەی خراپە ترساندن.

وەزارەت **" وزارت "**: وەزیری، پلەوپایەی وەزیری.

**وەجد** " وجد ": ئەوین و خۆشەویستی، زەوق وشەوق، شەیدا وسەودا سەری کەسێک بون ، خۆشی، خۆشحاڵی.

**وجووه :** کۆی " وجهه= وەجهه ": ڕو ، روخسار ،ڕوی شتێک (٢) ڕێگا ، لایەن، نییەت ، هۆ، (٣) گەورەی قەوم، (٤) کەسێکی پایەبەرز، (٥) پارەوپوڵ .

**ویجدان** " وجدان ": نەفس و هێزی باتینی نەفس، ئەو هێزە باتینییەی کەبەهۆی ئەولەچاک وخراپی کردەوەکان تێ - دەگەین .

**وجود :** (١) بون ، هەستی، پێچەوانەی عەدەم (٢) لەش ، بەدەن ، جەستە .

**وێرد** "ورد": زیکر، دوعا ، کەمێک لەقورئان کەئینسان هەمو شەورۆژی بیخوێنێ .

ویسعەت " وسعت " : گوشادی، هەراوی، بەربلاوی جێ - پانایی .

ویلداش : هاورێ، دۆست ، رەفیق ، هاواڵ ، وشەیەکی تورکی یە .

**وەحید** "وحید": تەنیا ، یەکتا .

هـ =

**هاتیف " هاتف "** : دەنگیغەیبی، ئاوازی غەیبی، دەنگ و سەدای غەیبی .

**هیجران " هجران"** : جودایی، دوری لەدۆست ویاران .

**هیلال" هلال"** : مانگی سەرەتای مانگ تاسی شەو ،کەبەشێوەی کەوان لەئاسمان داخۆی دەنوێنێ، کینایەتەبۆبرۆی دڵبەرولاوازی ـ دڵدارو عاشق .

**هەراس "هراس "** : ترس وبیم .

**هەمجالیس** : هاونشین ، دۆست ، هاورێ، رەفیق .

**هیممەت " همت "** : بڕیاروکۆششی بەهێز ، مەبەست ،توانا .

**هەیئەت " هیئت "** : (١) روخسار ، شێوە ، حاڵ، روخسار و وەزعی هەرشتێک (٢) پۆلێک خەڵک ، تاقمێک خەڵک ، دەستەیەک خەڵک .

**هیندو "هندو"** : هیندێ، خەڵکی هیندوستان، تیرەییکە لە هیندوستان مەزهەبی تایبەتی خۆی هەیە وهیندوسیشیان پێ دەڵێن، کینایەتەبۆزوڵف وخەت وخاڵی ڕەشی دڵبەرو خۆشەویست .

**هیدایەت "هدایت "** : ڕێ، پێشان دان ، ئاراستەی ڕێی راستکردن .

**هودهود** : شانەبەسەر، پەپو سلێمانە ، پەپوسولەیمانە ، پەپوسلەمانکە ، باڵندەییکەڕەنگی خۆڵەمێشی یە ، خاڵی زەردو ـ ڕەش وسپی هەیە ، لەکوتربچوکترە ، پوپەییکی وەکو تانج لەسەر سەری داهەیە ، دەڵێن چاوی گەلێک تیژو وردبینە ، لەخۆش خەبەری دا بێ وێنەبووە .

**هــودا "هـدى"** : خـودا ، ڕاستی، ڕێیڕاست ، رابەر، ڕێ –
پێشانـدەر .

**هــووەیــدا "هـویـدا "** : ئاشکــرا ، دیــار، روناک ، پەیدا .

ی =

**یەعقوب "یعقوب"**: کوڕی ئیسحاقە، بەناوبانگترین و گەورەترین پیاوماقوڵانی عیبرانی یە، لەقەبی ئیسرائیلە، بەنی ئیسرائیلی بردەمیسروماوەیەک لەوێ ژیانی بردەسە، دوازدەکوڕی هەبو بەناوبانگترینیان حەزرەتی یوسف بو، دوازدەتیرەکانی بەنی ئیسرائیل بەناوی ئەوانەوەیە، لەقورئان داباسی کراوە.

**یوسف**: " سەدەی سێزدەی پێش زایین، کوڕییەعقوب وناوی دایکی راحیلە، رەمزی جوانی یەلەناوپیاوان دابەپێی تەورات براکانی فرۆشتیان بەهەندێ لەبازرگانان، لەپاشان بوبەوەزیری فیرعەونی میسر وبەڕێوەبەری ئازوقەلەبرسی یەتیەکەدا، بەپێی قورئانیش براکانی خستیانەبیرێکەوە بەهۆی هەندێ کاروانچی یان رزگاری بو، بردیانەمیسروفرۆشتیان بە"پوتیفار" واتەعزیزیمیسر، زولەیخای ژنی عەزیزگیرودەوسەوداسەری یوسف بو، بەڵام یوسف دەستی لەگەڵ تێکەڵ نەکرد، لەبەرئەوەلای مێردی بوختانی پێ کردوخرایەزیندانەوە، لەئەنجامدا لەزیندان هاتەدەرێ وبوبە وەزیری فیرعەون ویارمەتی یەعقوب وبەنی ئیسرائیلی داکەسینا بکەن بەمەلبەندی ژیانی خۆیان.

**یەدی بەیزا "یدبیضاء"**: دەستی سپی، ئیشارەتەبەوە کە حەزرەتی موسا پێغەمبەرکەدەستی دەکردبەباخەڵیاودەری دەهێنا تروسکەوشەوقی ئەدایە وەودە روبەری خۆش هەموروناک دەکردو حەزرەتی عیساکە فوی لەمردودەکردزیندودەبووە.

**یەنبوع "ینبوع"**: سەچاوە، کانی.

* * *

ئەوەی شایانی باس بێ بۆفەرهەنگی ئەودیوانەلەفەرهەنگی عەمید وفەرهەنگی موعین وبەتایبەت لە فەرهەنگی دیوانە "نالی" یەکەی ماموستای زانادوکتور" مەعرۆف خەزنەدار" سوودم وەرگرتووە.

---

پێغەمبەری مەزنی ئیسلام حەزرەتی مُحَمَّدرەسولی ئەکرەم( د ـ خ) ـ فەرمویەتی :

کەسێک بەچاکەی خەڵک نەزانێ بەچاکەی خوداش نازانێ، جا لەبەر ئەمە پڕ بەدڵ لەدۆستی بەرێزو زاناو فەرهەنگ ، خۆشەویست و دڵسۆزم جەنابی ماموستا محەمەد صاڵح ئیبراهیمی محەمەدی ( شەپۆل ) زۆر سپاس دەکەم کە بە دیوانی حەریق دا چونەتەوەو هەڵەی گرتوەو نیشانەکانی بۆ داناوە.

خاوەنی اِنتشاراتِ محمّد محمّدی، کردستان ، سقز

١٥ی ڕێبەندانی ١٣٦٨ هەتاوی.